نەبوە، بیان تر سێنیّ؛ لە(إیمان)بە (شخص)یّ (آخر)، (دەعْوا)ی(رسالەت)بکا؛ یاخود؛ (دەعوەت)یان بکا، بۆ (شرك) وەبیان ترسێنیّ، لەسەر (ترك)ی یاخود؛ جوو(مَثلاً)ئەڵێن: ئێمە (صاحب)ی (شریعەت)و (کتاب)ین؛ (رسول)یّ وەکی (کلیم الله)مان بۆ هاتیە، بە(کتاب)یّ وەکی(تورات)، (إیمان)بە (محمّد)ی نایەنین؛ (حاجەت)مان نیە؛ گەر(مقبول)گەر (غیر)ە (مقبول) (نوعاًما) (توّهّم)یّ ئەروا(أمّا)ئێوە بۆ؟ (آبا)ی ئێوە لەسەر (عبادەت)ی(أصنام)چیان بە مستەوەیە؟ ئێوە(تمسّك)ی پێ بکەن؟ ئەوە (قوەت)ی (علمی)، (قوەت)ی(مادّی)یان، کەپیّ ی (مغرور)بن، گۆی یا(مُلك)و(سلطنە)یان لیّ ئەستێندریّ ئەگەر (إیمان)بێنن﴿وكَذَّبَ الَّذينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ یەکیّ لەوان(فرعون)ە، کە(دەعْوا)ی خوایەتی ئەکرد؛ (شعب)ی، ئەوەیان بەخوا ئەزانی ﴿وَمَا بَلَغُوا﴾ ئەوانی خۆمان؛ (سادات)ی(قریش)، (أشراف)ی (کلّە) ﴿مِعْشَارَ﴾ (أقَلُّ قَلِيل)﴿مَا آتَيْنَاهُمْ﴾ ئێوە بەچی (مغرور) ئەبن؟ چاوتان لەدووی چیە لە قیستان بچیّ؟ (تاج)و تەخت و ئاوڕەنگ و شاهی، جهان بانی، شەهریاریتان لیّ (غصب) ئەکریّ؟ (أوّل)و (آخر)و (ثروەت)و سامانی ئێوە چیە؟ دەپانزدە حوشتری گەڕوگوڕ؛ پێنج شەش کچ و کوڕی ڕووت و قووت؛ یەك دوو (عبد)ی لچ ئەستوور یەك دوو(جاریە)ی ڕەشی برش، ددان گڕی، چاو زەرد کیّ(طمع)لە جاهوو (جلال)و (حشمەت)و (موکنة)ی ئێوە ئەکا؟ ﴿فَكَذَّبُوا﴾ ئەوانی ڕابردووی، (أقویا)ی (صاحب)ی ئەفری فرویی وە(فیالق)ی (عسکری) ﴿رُسُلِي﴾ ئەوانەی بۆیان، چوون؛ ناردران لە(طرف) خوای ﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ چمان پیّ کردن؟ چمان بەسەر هێنان؟ لە(جَزا)ی ئەو (مُنكَرات)ە، کە خوا (إنکار)ی ئەکرد لای ناخۆش بوو، پیّ ی (راضی)نەبوو. آخ بۆ (لسان)یّ (واسع)؛ (مقابل)ی (مفرد)بە (مفرد)، (مُركّب)بە (مُركّب)! ﴿قُلْ إِنَّمَا أَعِظُكُم بِوَاحِدَةٍ﴾ ئەوانە لە(حق)پێغەمبەر، (بعضاً)ئەیان ووت:"(مجنون)ە" (أنَّهُ) لە (أوّل)ەوە (لسان)نای هێنی، (نسبة)ی (جِنّة)ی بۆ بدا؛ ئەوەندە دوورە، (غیر)ە

(معقول)ە یەك (نصیحەت)تان ئەكەم﴿أَن تَقُومُوا لِلَّهِ﴾ هەستن بۆ خوا؛ (یعنی)بێ (میل)و (محابا)﴿ مَثْنَى﴾ دوو دوو بە (جماعەت)﴿ وَفُرَادَى﴾ یەك یەك بە (مُنفرد)ی ﴿ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا﴾ لە(محمّد)ی(صاحب الدعوە)﴿ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ﴾ (بعد التأمّل)لە(أحوال)ی لە (أقوال)ی، لە(تَدابیر)ی، لە(وضع)ی (شرائع)و (قوانین)ی، لە(إقامە)ی(حُجج)و(براهین)ی لە(عزەت)و (كرامەت)ی (نفسی)، لە(شهامەت)و (آداب)و (وقار)ی؛ ئەزانن؛ لێتان (محقّق) ئەبێ، (سیّد الكونین)لە (جِنة) (بَرّا)یە؛ بەڵكو(مُحقّق)تان ئەبێ (أعقل)ە، (أكمَل)ە (أفضَل)ە، (نَبی) (حُكما)یانە؛ (حَكیم)ی (أنبای)یانە؛ (ذاتاً)خۆیان ئەیناسن، وە(شاهد)ن لەسەر(أخلاق)ی (عَظیم)ی. هەندێ(ذوات)لە(بشر)هەڵ ئەكەون، بە(شاذ) (حساب)ن؛ ئیشی وا ئەكەن، (خارج)ی (دائرە)ی (عَقل)ە؛ ئەگەر بنوارنە (عَقل)، بەقسەی (عَقل)بكەن، (قطعیاً) (إقدام)ناكەنە، سەر ئەو جۆرە كارانە؛ لە(رجال)ی(دنیا) (مثلاً) (ناپلیون)چی كرد؟ (قسم)ی لە(عُلما)ی (أوروپی) (نسبة)ی(جنّة)ئەدەن، بۆ ئەو(نَوع)ە؛ (یَعنی)كاریان، كاری (خِرد) نیە؛ (أمّا)ئەو (نَوع)ە (ذات)ە، بەچە(قوەت)ێ (إقدام)ئەكا؟ چ(روح)یكی هەیە؟ (مجهول)ە (جناب)ی(رسالەتپەناە)؛ تەك وتەنیا، بە(مقابل)ی (أنام)ڕاوەستا؛ نە(تابع)ی (حكومات)ونە(شرائع)ی (دەعوەت)ی (أنام)ی ئەكرد، ئەی فەرموو: "من (رسول)ی خوام، بۆ (عالم)ی ناردیمە، پاشاهانی ڕوویی زەمین، (عُلما)و (حُكما)و (قُوّاد)، (رأساً)ئەبێ (إیمان)م پێ بینن، وە (تابع)م بن" لەسەر ئەوە (عالم) (عداوەت)ی كرد، (زێد)ە خزمانی خۆی؛ (صَبر)ی گرت، (دوام)ی كرد؛ ئەو هەموو(أذیّة)و (مرارەت)ەی چێشت؛ دەستی هەڵ نەگرت؛ (آخر)ی (موقّف)بوو؛ (بالفعل)كاغەزی(دەعوەت)ی بۆ شاهە شاهی إیران و امپراطوری روم نووسی؛ ئەمە چیە؟ لەچیە؟ بوە (صاحب)ی(دەعوەت)؛ (واضع)ی (أحكام)؛ (فروعی)و (أصولی)؛ (قائد)ی(حرب)؛ (إمام)م (محراب)؛ (خطیب)ی سەر (منبر)و(ساحە)یی(قتال)؛ ئەو (جِنّة)ە یە، (حُكما)ی (عقلاء) (نسبة)ی

ئەدەن، بۆ (رسول)ی (أعقل)و (أعلم)؛ (لكن) (ناشئە)ی ئێمە، لەو (تعبیر)ە ناگەن؛ (أمّا) (جلال نوری)ئەزانی ئەو (جنّەت)ە چیە؟ بۆ یە هەزار جار(عقل) (فدا)ی ئەو (جنّة)ە ئەكات. (مصطفی كمال)یش یەكی بوو، لەو (مجنون)آنە؛ (حتّی) ئەمڕۆ (نسبەت)ی (جنّەت)بۆ (هتلر)ئەدەن، كە (كرّە)ی ئەرزی، لەبەری ئەلەرزی؛ ئەگەر ستایشی (رسالەتپەناه) بكەین ئەوەی (صاحب)ی (بُردیّە) فەرموویەتی، (إنشاد)ی ئەكەین:

كفاك بالعلم فی الأمیّ معجزةً

في الجاهلية والتأدب فی اليتم

فمبلغ العلم فيه أنه بشرُ

وأنّهُ خير خلق الله كلهم

دع أدعته النصاری فی نبيهم

والزم بما شئت مدحاً فيه واحتكم

(حقاً) (نادر الوجود)یكە، لە(عالم)ی (بشریەت)، یەكیدی وانەبوە، وە نەئەبێ ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ﴾ لێرە ئەوەندە (مقصود)ە، (مقام)ی ئیتریش نیە ﴿لَّكُم بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾ نێزیك (وَكُلُّ آتٍ قَرِيب) ﴿قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ﴾ ئەگەر ببێ ﴿فَهُوَ لَكُمْ﴾ (یعنی) (طلب)ی (أجر)ناكەم، (طماع)م نیە هەركەس (صاحب)ی (رئاسەت)و گەورەیی خۆیەتی ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ﴾ (ذاتاً) (أجر)ی (رسول)ی (أكرم)هەر بەخوای ئەدرێ﴿وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ﴾ (سر)و (علَن) ﴿شَهِيدٌ﴾ ئەو ئەزانی؛ من چی ئەكەم، بۆ چی ئەكەم﴿قُلْ إِنَّ رَبِّي يَقْذِفُ بِالْحَقِّ﴾ ئەوی ئازابێ، بیگریتەوە؛ (تَخصیص)بۆ كەس نیە ﴿عَلَّامُ الْغُيُوبِ﴾ ئەزانی كێ (إستفادە)ئەكا، كێ نای كا﴿قُلْ جَاءَ الْحَقُّ﴾ (دین)ی (مُبین)؛ (رسول)ی (كریم) (قرآن)ی (حَكیم)؛ (أمّا) (سَیف)نا ﴿وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾ نە ئی نوێ دادەنێ، نە ئی كەون ئەهینێتەوە؛ (یعنی)نامینێ. (أما) (بعض)ێ لەبەر (ظاهر)ی ئەو دوو (فعل)ە، كە لە(إدراك)

ئەوەشێتەوە؛ (باطل) (تَغیر) ئەکەن بە (إبلیس)؛ (لكن)بە (عنا)یەیە کە (معلوم) بوو (حاجە) بەو (تفسیر)ە نیە ﴿قُلْ إِن ضَلَلْتُ﴾ (بالفرض)ڕێم بە (حق)نەبرد﴿فَإِنَّمَا أَضِلُّ عَلَى نَفْسِي﴾ بە(إعتماد)لەسەر(نفس)ە. (جناب)ی (حَق)؛ (حَق)و (باطل)ی (بیان) فەرموو؛ (حال)ی (إبلیس)یش بەتەواوی (إیضاح) فەرموو ئەوجا ئەگەر (ضلال)بێ؛ ماکی (نفس)ە؛ ئەوی (إصلاح)کەن؛ (أثر)ی (باطل) –(بِالمَرَّة)– نابووت ئەبێ ﴿وَإِنِ اهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِي إِلَيَّ رَبِّي﴾ دیارە (وَحی) (إلهی) (خَطَأ) ناکا؛ وەکی (عزیزە)؛ کەوابی بۆ (هدایەت)و (سلوك)ی ڕێ ی ڕاست (وَحی) (لازم)ە؛ هەرچەند (عاقل)و (مُدبِّر)و داناو (حَکیم)بێ؛ بێ (وَحی)خوداوەندی؛ کە (صاف)ە لەهەموو (میول)؛ (شَرع)ی پاك(وَضع)ناکرێ بۆیە (معتزله) گەرچی (إعتماد)یان لەسەر (عَقل)زۆرە (أمّا)بۆ (هدایەت)و (وَضع)ی (شریعەت) (إحتیاج)ی یان بە(رسول) هەیە؛ (حتّی) (إرسال)ی (رسول) لەسەر خوا (واجب) ئەکەن ﴿إِنَّهُ سَمِيعٌ قَرِيبٌ﴾ ئەبیە، (حال)ی (بَشر)ئەزانی (قُرب)و (بَعد)ی ڕاستی بە (علم)و (جَهل)ە؛ ئەوی بزانی لێت نێزیکە؛ (وَلَوْ حِساً) دوور بێ؛ ئەوی ئەیزانی لێت دوورە؛ (ولوحساً)نێزیك بێ؛ لەبەر (قُرب)ی (علم)ی خوا(شَرع)ێ (مُوافق)ی (حَال)ی (بَشر)لە (عَوارض)و (طواری)و (مَصالح)و (مفاسید) دادەنێ؛ (فَرق)و جودایی ناکا، (إلاّ)بەگوێرەی (فَرق)ی (طَبیعی) ﴿وَلَوْ تَرَى﴾ (خَطاب)ێ (خاصّ)ە یا (عامّ)ە﴿إِذْ فَزِعُوا﴾ (وَقت)ی ئەو (فَزع)ە (حین البعث)ە؛ یا (قیامەت)؟ ئەگەر (حین البعث)بێ؛ لام وایە (خِطاب)بۆ (جناب)ی (رسالەت پەناه) نابێ؛ (قیل، قیل)ی تر هەیە؛ بۆ (بَیان)ی (وَقت)ی (فَزع)؛ لە هەمووی دوورتر (فَزع)ی (سُفیان)ییە لە(زمان)ی (مهدی)؛ یاخود هەشت هەزار کەس، ئەچن، بۆ (تخریب)ی (کعبە)لە (صَحراء) بەعاردیدا دەچنە خوار؛ ئومیدە تا (مَلك)ی (حِجان) (مَلك إبن السعود)پایەداربێ کەس نەتوانێ، بۆ (تخریب)ی (کعبە)بچێ﴿فَلَا فَوْتَ﴾ قورتار بوون، لەدەست چوونیان نیە ﴿وَأُخِذُوا مِن مَّكَانٍ

قَرِيبٍ﴾ له (دَور)ی (مراقد)یان یا نیّزیك ئـاگر ﴿وَقَـالُوا﴾ ئـەو (وەقـت)ی ﴿آمَنَّـا بِهِ﴾ به (رسول)﴿وَأَنَّى لَهُمُ التَّنَاوُشُ﴾ (تناوش) (تنـاول)و وەرگرتنـی (سَهل)ە، بۆ شـتی نیّزیك؛ ئـەو(تنـاول)ە، لـه (دار)ی(تكلیـف) نیّزیـك بـوو، (سَـهل)بـوو (أمّا)ڕۆژی (قیامەت)نـابیّ ﴿مِـن مَكَـانٍ بَعِيـدٍ﴾(زمـان)ی (تكلیـف) نـەما؛ (أمـّا) (تفسیر)ی به(رجوع)، جوان نیه ئەو (بُعد)ە(بُعـد)یّ (مَعنـوی)یـه ﴿وَقَـدْ كَفَـرُوا بِهِ﴾ به (رسول)؛ (إیمان)ی (بالرسول) (مستلزِم)ە بۆ (إیمان)ی (بالله)، (ولَوْ)كه (أصل)ی (إیمان)، (إیمـان)ی (بـالله)ە ﴿مِـن قَبْـلُ﴾ لـه(دار)ی (دنیـا) (زمـان)ی (تكلیف)﴿ وَيَقْذِفُونَ بِالْغَيْبِ﴾ بیّ (علم)قسەیان ئەكرد ئەوی هەوەسیان لـیّ بـا، بەدەمی ئـەیان هاویشـت ﴿مِـن مَّكَـانٍ بَعِيـدٍ﴾ (رَمـی)یـان (إصـابە)ی نـەدەكرد قسـەی نالایـەق و دوور، بـە(شَـخص)ی (مَعصـوم)و(بَـری) نـای گـاتیّ؛ ئەمـە قسەیە؟ بە(ذات)یّ وەكی (محمد المصطفی)بلّیّن:"(مجنـون)!" خـوا ئـەیزانی، گەلیّ لە(راوی)یەكانی ئیّمەش وان؛ دەر(حَق) (ذات)یّ زۆر گـەورە؛ شـتی گـەلیّ نا(لایق)و دوور (نقل)ئەكەن؛ خوا لـیّ یـان خـۆش بـیّ ﴿وَحِيـلَ بَيْـنَهُمْ وَبَـيْنَ مَـا يَشْـتَهُونَ﴾ (لذائـذ)ی(دنیـا)وو (نجـات)لـە(عـذاب)و(نیـل)ی (نَعیم) ﴿كَمـا فُعِـلَ بِأَشْيَاعِهِمْ﴾ (أشـباه)یـان؛ ئـەوانی (تكـذیب)ی(رسـول)ی خۆیـان كردبـوو ﴿مِّـن قَبْلُ﴾ پیّش ئەوانە﴿إِنَّهُمْ كَانُوا فِي شَكٍّ مُّرِيبٍ﴾ وەكی (عِنادیّە)؛ (شـاكٌ فِـی أنّـهُ شـاكٌ) (شـك)یـان ئـەیان هاویّتـە (شـكی)یّ؛ (ذاتـاً)لـە(شـكوك)یـان (مـتردّد)ن (أنواع)ی (تفوهّات)ئەكەن. (جزم)ی ڕۆژی(جزا) (شك)ی (دار)ی (دنیـا) (إزالـه) ناكا؛ (عاقل)له (حال)ی وانه (مُتحیّر)ە؛ لەجیّ ی (رَیب) (هیچ) (شـك)یـان نیـە؛ بیّ (شـك)و (شُـبهە) (عبـادەت)ی گوسـالەو(أمثـال)ی ئەكـەن؛ بـۆ (تصـدیق)ی (رسول) (شُبهات)ئەنویّنن؛ (أنّهُ)ئەوەندە (نُقّاد)ن؛ ئەوی لایان(نوعاًمـا) (شـك)و (شبهە)كی تیابیّ، (قبول)ی ناكەن .(تفسیر)ی(سورە)ی (سبأ)تەواو بوو؛ پـاش نیوە ڕۆژی یەك شەموو(١٧)ەی مانگی (مولود)ی؛ (٢٤)ی مانگی نیسانی رومی سنە ١٣٥٨هجری ١٩٣٩میلادی پیّشی ئەلّیّن:"

سورەی(فاطر)یا (سورە)ی (ملائکە)

"(زمخشری) ئەفەرموێ:" پاش(فُرقان) (نازل)بوە" ئەوی بۆ(تأخیر)بوە؛ لەدوای (سبأ) (ذکر) کراوە؟ (إمام)ی (بلاغەت)قسە لەو(مخالفات)ە ناکا؛ نازانم (مکیّ)یە هەمووی؟ بە(قول)ی (إبن عباس)ی (إلاّ) دوو (آیەت) نەبێ؛ لای (حسن)چل و شەشە، یا چل و پێجە، (عدد)ی(آیات)ی. نا(شکُر)ی نەبێ، (إتفاق)یان لەسەر هیچ نیە؛ (قوّە ت)ی (ربط)ی(آلآن)دەر ئەکەوی :

بِسْمِ ٱللَّهِ الرَّحمنِ الرَّحيم

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ (موُجِد)و (خالق)یانە، بێ وێنە؛ (یَعنی) (مُبدِع)؛ (صاحب)ئەفەر موێ:" (إبن)فەرموویەتی:" نەم دەزانی (فاطر) (معنا)ی چیە؟ تا دوو(عەرەب)هاتن؛ (مُخاصمە)یان بوو، لەسەر بیرێ؛ یەکیان ووتی: "أنا فطرتهُ" ئەمن(إبتدا)م پێ کردیە"

ئەوەی (خالق)ی (أصول)و (عَناصر)و (مُحتاج إلیە) (أشیا)بێ، (خالق)ی ئەو(أشیا)یەشە؛ وە ئەوان (إحتیاج)یان زێترە﴿جَاعِلِ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا﴾ ئەوانەی ئەو (مُشرِك)انە بەخوا؛ بە(بنات الله)یان ئەزانی؛ کە لە(سورەت)ی (سابق) (بیان)ی فەرموو؛ (سؤال)لە (مَلئکە)ئەکرێ؛ ئەوانیش (تبرّی)ئەکەن؛ (ملائکە) (محجول)ن بە(حَجل)و (خَلق)و (إیجاد)، لە(خَلَق)ی (کائنات)و (عناصر)و (مرکبّات)، (دَخل)یان نیە؛ وەکی(سائر)ی (أجسام)و (حیوانات) (إحتیاج)یان بە(مکان)و (آلات)هەیە؛ ئەوەی بلّێ:" (غَیری) (مَوجودی)هەیە، (إحتیاجی)بە (فراغ)ی نیە، لەو(فضا)یە (فسیحە) (إشغال)ی کا"؛ (خطأ)ئەفەرمووێ؛ (ممکن الوجود)بێ جێ نابێ؛ لە(عالَم)ی (إمکان)دانیە، (ذات)ێ (مناسبە)ی (ذات)ێ، لەگەڵ (فطرەت)ی (کبریائی)هەبێ. (نفوس)و (أرواح)ی (فلك)یش، کە(أوائل)ی (حکما)ی (یونان) (قول)یان پێ کردیە؛ خۆی نیە. ئەمە گوێ یا (أفلاك) (متحرّك)ی (بالإرادە)ن؛ (إرادە)ی چی؟(مُسخّرات)ن.

(غاية الغاية)لە(جَعل)ى (ملائكە)، (جَعل)ى وانە بە(رُسل)، بۆ سەر (رسول)ى (بَشر)؛ لە(أوّل)ەوە (وَحى)يان بۆ ئێنن؛ ئەوانەش وەكى ئەڵێن:" (لطيف)ن" (مُجرَّد)وبێ (مادّە)ين ﴿أُولِي أَجْنِحَةٍ مَّثْنَى وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ﴾دوو دوو، سێ سێ، چوار چوار، بە(قوەت)ن بە(سرعەت)ن؛ (قابل)ى (إستخدام)ن، بۆ(جهات)ى (مُخلفە)؛ (بسيط)و(روح)ى (مجرّد)ين؛ (لَطيف)بن؛ وەديارە، لەسەر (صورەت)ى گاجووت و ماجووت نين. هەرچەند(إنسان)ناتوانى (تصوير)ى فڕين بە چوار باڵ بكا، قەى ناكا؛ باسێ چوارێكيديش (زياد)بێ؛ (أمّا) شەش سەد هەزار باڵى، هەر باڵە، شەش سەد هەزار پەڕ، هەر پەڕە، مانگ و ڕۆژى وەكى مانگ و ڕۆژى ئێمەى تيا بێ، نايەتە (وهم)و(خيال)؛ (لكن) (نقّال) لەدواى (خيال) (جَولان)ئەكەن؛ وا(وهم)ئەبەن (عَظمە ت)و(قُدرەت)و (قوەّت) لە (جسامەت)و زەلامى دايە﴿يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ﴾ (مراد) زێدە باڵى (ملائكە) نيە؛ (عامّە)؛ شتێوا(خَلق)ە، ئێمە بە(خيال)مان دانايە، نازانين چيە؟ وە چۆنە؟ ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ يەكى لەسەر (ملائكە)و(غَير)ى (ملائكە) نەكەوتوە (يخلُقُ مايَشاء ويَختار) (في الحَقيقة)ئەمڕۆ لە(عالَم)ى (كَون)، (دَليل)ێ لەسەر (وجود)ى (ملائكە)و(جن)نيە؛ (تابع)ى (سَمع)ن (السّمعُ والطّاعةُ) (أمّا)بە (نوع)ێ نەبێتە بێ گوێيى ﴿مَا يَفْتَحِ اللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ﴾ (إرسال)ى كا، بينێرى، دەركەى (ڕەحمەت)ى لێ بكاتەوە﴿فَلَا مُمْسِكَ لَهَا﴾ كەس نيە، بێ گرێ، نەيەلى، بێ﴿وَمَا يُمْسِكْ﴾ئەوى بێ گرى ﴿فَلَا مُرْسِلَ لَهُ مِن بَعْدِهِ﴾ (بعد الإمساك)نە(جن)، نە(إنس) نە(مَلَك)؛ ئيتر بۆچى ئەوانە ئەپەرستن؟ چ جايە گاجووت و(أشباه)ى ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ ئەوەى (غالب)و بە(حكمەت)و (مصلحەت)كاران بكا؛ كێ ئەتوانى (مقابلە)ى بكات؟ (غَير)ى ئەو چ (قدرەت)؟ چ(قوەّت)و (غالب)؟چ (علم)و(حكمَت)يان هەيە؟ ئەگەر هەبێ (محدود)ە، (ناقص)ە، (شامل)و (كامل)نيە؛ (ولَوْ) هەزار (جَناح)ى هەبێ. ئەوەى لە هەموو(وجە) (كامل)بوو، بەهيچ (وجە) (مُعارضە)ناكرێ،

وه(معاون)یشی گەرەك نیه ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ ئەوەی (داخل)ی ئەو(عنوان)ەیە ﴿اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ بە(شُكران)ە ﴿هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ؟﴾ کە ئێوە (ظنّ)ی (شرك)ئەبەن؛ دیارە(شریك)ی (خالق)ی ئەبێ(خالق)بێ؛ چ(خالق)ێ هەیە، (غیر)ی خوای؟ ﴿يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ﴾بە(مَطر)و (نبات). ئەو (تحریر)ی لە(آیة)ی(سوره)ی (سابق)مان نووسی، بۆ ئێرە(مُناسب)ە ئەوەی (خالق)ی (حیوان)و (إنسان)بێ، چونکی وای(خلق)کردینە، کە(مُحتاج)ی (رزق)بن، ئەبێ (رازق)یش بێ (خالِق)ێ (رازِق)ئەبێ، چ کەڵکی هەیە؟ بۆچی بی پەرستم؟ (مَوقع)ی (هَلْ) (مقام)ی (حُسن)و(قُبح)ی، (مخالفە)ی لەگەڵ (همزه) لە(علم)ی (بلاغەت)دایە، وە(طول)و (تفصیل)ی لە(کلام)ی (سَعد)ی (أکبر)لە (مُطوَّل)و گفت و گۆی (مُحَشّی)یان دایە؛ (تفسیر)ی کوردی هەڵی ناگرێ؛ (وکذا) (إعراب)ی ئەو(آیة)ە بە(لسان)ە (کوردی) (أدا)ی (زەحمەت)ە. نا(شکری) نەبێ زوبانی ئێمە نەبوە بەزوبانی (علمی)، تائەویش بە زوبانی خۆی، بە گفت و خۆی، شتێ دانێ وەکی (نحوی) (عربی).

(بعض)ی (معتزیلە)بە (إنسان) بە(حیوان)ئەڵێن:" (خالق)" (یعنی) بۆ (أفعال)ی (إختیاریه)؛ (أمّا) (خالیقەنی) (إنسان)لای وان بۆ (تشریك)نیە؛ بۆ (مجازات)و (مکافات)ە؛ وە(إجتماع)ی (خلق)و(کسب) لەسەر یەك شت لایان (معقول) نەبوە؛ (حقیقة)شتێ خوا (خلق)ی کا رێی (کسب)ی سەیرە، وەنامینێ! تەماشای ئەو هەموو(حیوانات)و (حُشرات)ەکە، کەدێتە سەر ئەو عەردە، هەمووی (إحتیاجی) بە(رزق)هەیە؛ کێ (رزق)ی ئەو (عالَم)ە ئەدا؟ کێ (رزق)ی ئەو (خلائق)ە (خلق)ئەکا؟ خوای(تعالی)ن ﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هەر ئەو (خالِق)ی (کائنات)، (رزّاق)ی مارو مێرو، (رازق)ی کرم، لەناو بەرد؛ (رازق)ی کرم لەناو سەلکەسیر دووبست لەبن عەرد. کەسێ بنۆرێتە (سعەت)ی (عالَم)، (سعەت)ی (رزق)، (حکمە ت)ی(خَلق)و (إیجاد)، ئەزانی ئەوە کاری(ذات)ێکە، (فوقَ الطّبیعة)، (مُدبِّر)ی(طبیعەت)، (ماعَدی)ی ئەو هەرچی (خیال)ی کە،

لەژێر (ناموس)و (قانون)ی (طبیعة) دەرناچی؛ (مادام) وابی ﴿فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ﴾ کوو، چۆن، وەر ئەگێردرێن؟ لە(توحید) ڕوو لە(شرك) ئەکەن. (شریك)ەکانیشیان بەچ ناچیٚ؛ (عەرەب)هەروەکی خۆیان لە(أُمم)ی دی بەرەوژێر بوون؛ بت پەرستنیشیان زۆر(دون)بوە (نَظر)بە بت پەرستی (أمم)ی دی؛ ئی وان بەبووکۆکانەی منداڵان ئەچی ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ﴾ (ذاتاً) (مُكذِّب) زۆرن، غەم مەخۆ ﴿فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ﴾ (عدد)یٚ زۆر﴿مِّن قَبْلِكَ﴾ (نوع)و (إبراهیم)و (موسی)و (عیسی)و گەلێکی تر ﴿وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الأُمُورُ﴾ نێك و بەد، (جلیل)و (حقیر) ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ﴾ (شامل)ە بۆ (حَشر)و (حساب)و (عذاب) ﴿حَقٌّ﴾ (ثابت)ە، وایە؛ (خُلف)ی نیە ﴿فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا﴾ بە(حیات)ی (دنیا)و(لذائذ)ی (مغرور) مەبن؛ ئەو(حیات)ە پڕ(آفات)ە، بێ (دوام)ە، (مغرور)تان نەكا؛ پیٚ ی لە(حیات)ی (أبدی) (غافل)نەبن ﴿وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ﴾ هەرچی هەبێ؛ مەڵێن:" خوا (غفور)و (رحیم)ە؛ لێمان خۆش ئەبێ؛ چی بەسەر (عذاب)ی ئێمەوەیە؟چ پەكی كەوتە؟" مەڵێن: "(رسول) (شفاعەت)مان بۆ ئەكا؛ ئێمە لە(أتباع)و (أولاد)ی (رسول)ین؛ (مُعذَّب) نابین" مەڵێن: "(فِدیة) (تقدیم)ك راوە؛ (بوذا)و(عیسی)خۆیان كردیتە (فِدیة)" بە قەشەو (مطران)و (أمثال)یان هەڵ مەخەڵەتێن؛ (مُقابل)ی گوناه– (بعد الإعتراف)– شتیٚ بدەنە (وكیل)ی (پاپ)؛ چی ئەكەن بیكەن. مەڵێن: "(حُبّ)ی (آل) (كافی)یە" مەڵێن: "(شێخ) (عهد)ی كردیە، بێ ئێمە ناچیتە بەهەشت" (ذاتاً) (معلوم)نیە، خۆی بی چێتیٚ ئەوانە هەمووی لە(طرف) (شیطان)ی (إلقا) ئەكرێن، گویٚ ی مەدەنی﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ﴾ (بِكُلِّ مَعنی الكَلِمة) دوژمنە ﴿فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا﴾ (رغم أنفه)تا ئەو بۆ (خراپە) (دعوەت)تان ئەكا، ئێوە چاكە بكەن؛ آنزیادە بەلای(دینی)ئاگادار بن كە بەناوی (دین) (غالب)بوو، چارە ناكری؛ ئەو (وەقت)ە (رؤسا)ی(دین) (إتّهام)كەن؛ ئەوی پێتان ئەڵێن؛ بیخەنە بەر(میزان)ی (عقل)؛ وە بزانن، پێش

هەموو شت (عقل)تان (سلب) ئەکەن ﴿إِنَّمَا يَدْعُو﴾ (شيطان)ی بیٚ(غیرەت)و (ناموس)و (شرف) ﴿حِزْبَهُ﴾ (فرقه)و (جمع)ی خۆی؛ وەك(رؤسا)ی (أحزاب)ی ئیٚستا ﴿لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ کەسیٚ (مُروّەت)ی هەبیٚ، بۆ(أتباع)ی تیٚ ئەکۆشی؛ لە شتی (خراپ) (حفظ)یان ئەکات، تا(نائل)ی (سعادەت)بن؛ (أمّا) (إبليس) ئەوەی (مُجب)ی (هلاك)یان بیٚ، لە(دارين)پیٚ یان ئەکا؛ (سوق)یان ئەکا بۆ ئاگریٚ (شدید)﴿ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ (بِأَيِّ وَجْهٍ مِن الكُفرِ)﴿ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ بە (واسطە)ی (متابعە)ی (شيطان)﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا﴾ (إيمان)یٚ خاوێن ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ (أمّا)ئەبیٚ بزانن (عمل)ی (صالح)چیه؟ (إنكليز) مانگیٚ (٣٠٠) (طيّارة) دروست ئەکا؛ ئیٚمە خەریکی حووحانیٚ بین؛ خۆی نیە! (عمل)ی (صالح) ئەمڕۆ، ئەگەر (رؤسا)ی(دین) (إنصاف)کەن، دیارە﴿لَهُم مَّغْفِرَةٌ﴾ (سَتر) ئەکریٚن، لەگوناهان﴿وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ (حَيِّ أكبر)بفەرمویٚ:"(كبير)" بەس نیە؟! ﴿أَفَمَن زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ﴾ (أنّە)ناشیرین (عمل)ی بۆ جوان کراوە؛ (قبيح) لەلای بوویتە(حسن)﴿ فَرَآهُ﴾ (عمل)ە (سُو )ەکەی، بە (واسطە)ی (تزيين)ی (إبليس)ی ﴿حَسَنًا﴾ شیرینی و جوانی ئەبینی. (ملا)یان لیٚرە (مُضطَرِب)ن لەبەر (مُقابِل)ی؛ ئەمن ئەڵیٚم:" ئایا ئەو(نوع)ە کەسە، بەکەس (هدايەت) ئەدریٚ؟" نا؛ (حتّى مع الأ سف)گەلیٚ لە(أهل)ی (عِلم)و (فَضل)لەو (جهەت)ە تیٚ کەوتوونە؛ بۆیە ئەمڕۆ (أمّەت) (قابل)ی (إصلاح)نیە؛ بە هیچ (وجه)نایەتە ڕای﴿فَإِنَّ اللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾ ئەو ئەزانی کیٚ (قابليّە) ماوە؛ کیٚ(إستعداد)ی فەوتاوە؟ ئەوەی(سُو )ی (عمل)بە(حَسن) بزانی، لەدڵیا (رسوخ)ی بوو بیٚ، (قابل)ی (هدايەت)نیە؛ (معلوم)ە گەلیٚ شت، (مُجرّد)ی (إمكان)بۆ (وقوع)ی (كافى)نیە؛ ئەمڕۆ بنۆڕە(حال)ی (بشر) کوو (أباليس)ەکان لیٚیان گۆڕیین! (حُسن)یان کردە(قبيح)؛ (قبيح)یان کردە (حسن)؛ (حتّى) گەلیٚ کەس وای چوویتە(دفاغ)ی، کە(حسن)نیە؛ بەس (أُلف)و (عادەت)ە شتیٚ لای(قوم)ی (عادەت)یان نیە، لەکنیان(قبيح)ە؛ لای(قوم)یٚ کە

(معتـاد)یـان، (حسـن)ە؛ بـەناوی (مدنیـەت)و(فنـون)ی (جمیلـە)، شـتی وایـان (مُستحسـن) کردیـە، کـەلای(مسـلّمان)ەکـانی بـاش لـە هەمووشـت ناشـرینترە؛ کوردیّ ئافرەتیّ (مـارە)بکـا، لەکەلـەی دەن، دەسـتی مـاچ ناکـا؛ سـەرامەدانی (مدنیّەت)، شاهەشازادەکان، بە(کمال)ی (إفتخـار)دەسـتی مـاچ ئەکـەن؛ لەبـەر ئـەو (تقلّبـات)ە، ئـەوی(أربـاب)ی (فکـر)و(نظـر)بـیّ، لـە(إصـلاح)ی(بشـری) (مأیوس)ە؛ بـە(ملیـون)یّ وەکـی(قادیـانی)وە(بهـا افنـدی) (عـلاج)نـاکریّ؛ بـیّ هوودە خۆیـان، بـۆر(إدّعـا)ی (باطـل)مانـدی کـرد؛ لەسـایەی وان، (آن)بـە(آن)، (قبایح)و (شرور)و (فسق)و (فجور)، لە(تزاید)و (نما)دایە؛ (مادم)وابیّ، ئەوانەی توو ئەتەویّ (إیمان) بێنن، نایەنن﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَاتٍ﴾ بـەخۆڕایی خۆت لەسەروان، بە(هلاك)مەدە، (حسرەت)یان بـۆ مەکـە؛ جـیێو جـاو(جهـنّم)؛ (إلی جهنّم وبِإس المصیر)؛ من(معنی)ی ئەو(آیە ت)ەم وا(عرض)کردن؛ حـەزتان لە(معرکە)یە، تەماشـای(تفاسـیر)ی تـر بکـەن؛ لام وایەقسـەیان(خـالی)نیـە، لـە (خدشە) ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ ئـەوەی(تـابع)ی (میـل)ە، بـە(إزالـە)ی (مَیـل) نـەبیّ، چـارە نـاکریّ؛ کـەلافاوی (میـل)هەسـتا(عقـل)وەك قانکەلاشـکە، بانەی با. هەندیّ(مسلّمان)ی کـۆیی، لـە(حـرب)ی(عمـومی) (أسـیر)بـوو بـوون؛ بردبوویاننە (هندستان)؛ بۆیان گێڕامەوە: ((بعض)یّ لە(هنـدوس)آن (هیکـل)ی ئەپەرسـتن؛ (مسـلّمان)یّ شـەویّ، ئـەی دزی، ئـەی هاوێتـەناو (خـَلا)؛ بـت پەرستەکان ئەکـەون(إضـطراب) (خـبر)ی (حکومـەت)ئـەدە؛ (بعد التحـرّی) لـە (قَدم)خانە ئەی هێننەدەر؛ ئەی شـۆنەوە؛ بـاز بـەناوی بابـە، بـانگی ئەکـەن!) جانەوانە چۆن چارە ئەکرێن؟ بت پەرستنیشـیان بـە(عقـل)نیـە، تابـە(دلیـل)ی (عقـل) (إزالـە)بکـریّ (غلـط)یـان دەرخسـتریّ. لـە(زمـان)ی (عمـر پاشـا) (والی) (موصل) بەگژ (داسنی)یان داچوو؛ (تمثال)ی (مَلكی طاوس)ی بەبەرشەقان دا؛ بە قۆندەرە ئەچوە سەری؛ (قوم)ی(داسنی) (وَلوله)یـان ئەچـوە ئاسمـان؛ بـاز (تمثال)یان لا (مقّدس)و(معبود)بوو؛ ئەو(نوع)ە (قوم)ە (إیمان)بە(آیا ت)نایـەنن

گەورەکانیان ڕابردینە؛ مەگەر(علاج)ی منداڵەکانیان بکرێ هەزار جاری﴿وَاللَّهُ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ﴾ یان بۆبخوونەوە لایان بای دێ!(منوَّر)ەکانیش، ئەی کەنە (أسباب)ی (طبیعی)؛ (مؤمن)ە (صالح)ەکانی (أولیا)پەرست؛ ئەیدەنە شێخان؛ ئێمە کەخوا پەرستین؛ چی بڵێین؟ ئەگەر (میل)ی (فاسد)و(فساد)نەبی، (مسئله) دیارە؛ پاش (إرسال) ﴿فَتُثِيرُ سَحَابًا﴾ وە(بعض)ێ (تأویلات)ی تریشیان کردیە بۆ (إختلاف)ی (فعلین)؛ بە(ماضی)و(مُضارعی)؛ (أمّا) (توجیه)ی(إمام)بۆ(ماضَویّەتی) (أرْسَل) (مُطّرد)نیە ﴿فَسُقْنَاهُ إِلَى بَلَدٍ مَّيِّتٍ﴾ ئەو (سوق)ە بۆ (مکان)ێ (لزوم)ی بەباران هەبێ، (علم)ی پێ ئەوێ؛ (ریح) نازانی کێندەرێ، پێی ئەوێ؛ بۆی ببا. (مُضارع)ی(إثار)ی (نظر)بە(إرسال)ە، (نظر) بە (حال)ێ (حاضر)، (ماضی)یە؛ بۆیە(سقی) (بَلَد)ی، بۆ(حضرەت)ی (ذی العظمە)ی کردەوە (ماضی) (نباتات)ی (أرض) هیشك ئەبێ؛ (قُوّە)ی (حیات) لە (مظاهر)ی (أرض)بزر ئەبێ؛ (أمّا) (مَعناً وباطناً) (بَقیّە)ماوە؛ بۆیە بە(شَدّە)ی ئەفەرموێ ﴿فَأَحْيَيْنَا بِهِ﴾ بەبارانی هەوری﴿الْأَرْضَ﴾ یە(إنبات)، (حیات)ی تیا (ظاهر) ئەکاتەوە-(سُبحان الله) (قُوّە)ی (حیات) (سِرّ)ێ (عجیب)ە؛ ساڵێ دەغڵ، خراپ بوو، هەرزانمان چاند، جوان ڕوا؛ نیوە کارەکەم ووتی: "ئەو هەرزنەم(١٥)ەساڵ بوو، هەڵ گرتبوو، لەکووپی"، (قوەت)ی (حیات)ی (ضایع)نەببوو؛ لەوە (أعجب) وە(أعجب إلى الغاية عجیب)کە (تووت عنغ آمون) (کشف)کرا، نەختێ گەنمیان دۆزیەوە، لە(خدمەت)یان دانابوو، چاندیان نەختەکی لێ شین بوو؛ ئەو چەند هەزار ساڵە، (حفظ)ی(حیات)ی بوو بوو ﴿كَذَلِكَ النُّشُورُ﴾ لە(ذرّات)ی(حیویّە)ی ئێمە، لە(مُدّە)یە(مدید)، (قوەت)ی (حیات)ی تیا بمێنی، کەگرد بۆ وە، (أثر)ی (حیات)ی (ظاهر)بێتەوە؛ دوور نیە. (أستاذ)ی (أعظم)ی(کیمیا) (مُحقّق) ئەتوانی بی کا﴿مَن كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ﴾ ئەوانەی (عبادەت)ی (غیر)ی خوا ئەکەن، (حقیقةً)زۆر بێ(عزە ت)ن؛ (شرف)ی (بشری)یان نیە؛ کەسێ (رکوع)بۆ گایەیا (شە)ی ببا؛ چاو نەوی مل کەچ و،

دەست لەسەر دەست، بەرابەری(جسم)یٚ ڕاوەستی (علی قدم الـذُل) ئـەوە چ (قـوەت)و (ذکـا)ی (نفـس)و (نزاهـەت)و (نزاکـەت)ی هەیـە؟ ئـەوەی (عـزەت)و (صلابەت)و (شرف)و (مناعەتی)ئەویٚ؛ (إیمان)بەخوا بێنیٚ﴿فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا﴾ بە(إیمان)ی (کامل)و (علم)و (عمل)، (إنسـان) (عزیـز)ئـەبیٚ، بلّنـد ئـەبیٚ؛ خـۆی ئەکاتە (مظهر)ی (صفات)ی (معبود)ی خۆی؛ ئەبیٚ بە(عالِم)و (قادِر)و (مُریـد)یٚ (ذی العزم) (سمیع)و (بصیر)و (مُتکلِّم)و (خطیب)و (مُبین)و (مُفهِم)و (مُرشـید)؛ (صانع)و (مخترِع)، لە(صُنع) (خلیفە)ی خوا؛ بە کـەر پەرسـتی چ پـەیا ئـەبیٚ؟ بەچی لە (رُتبە)ی (جمادی)، (حیوانی)ئەچێتە دەر؟(أولیا)ی(زەمان)ە هـەتکی (نفس) ئەکەن، (أنواع)ی (رذالە ت)دەکـەن، کـە(حیـوان)لـە (حرکـات)یانشـەرم ئەکا، بـەخۆدا دەشـکێتەوە. (بعضاً)ە نزکەنـدن خۆیـان ئەشـکێنن، (هضـم)ی (نفس)ئەکەن؛ (أمّا) (حقیقـةً) (عجایـب)ە؛ (بعـض)یٚ (شـەدەڵە)یـی فێـر ئـەبن وەکی (مەنزە لیۆن) تەقە ئەکاو ئەڕواو ناژمێردریٚ؛ تا(میل)ی لـیٚ بـیٚ، نـابڕیٚ! ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ﴾ (أولاً): (لاإله إلاّ الله)، (ثانیاً): (تقدیس)و (تحمیـد)و (تکـبیر)و (دوعـا)و (نصـیحەت)و (علـم)و (دەرس)ی (أحکـام)ی (إعتقـادی)؛ (کلمە)یە بۆ (إصلاح)ی (ذات البین) تا (إعتقاد) پاکتربیٚ، بیٚ(غـلّ)و (غـش)بـیٚ، بـۆ لای خـوای بلّنـد تـر ئـەبیٚ؛ (صـاحب)یٚ (زیـادە) (تقـرّب)و (ترقّـی)ئـەکا؛ (إیمان)ی ئێمە ئەگەر وەکی (أوائل)ی (صحاب)آن، بیٚ(غلّ)و (غش)بـا، (روح)ی (لطیف)چۆن ئەوانی(بلّند)کرد، ئێمەش بلّند ئەبووین؛ لای(أقلّ)ی نەدەکەوتین؛ (أمّەت) تووشی ئەو (إنحطاط)ە نەدەبوو؛ (مع الأسف) (رؤسا)ی(مذاهب)وایـان لە(أدیان)ی (سماوی)کرد، کە لە(نظـر)ی (طبیعیّـون)بوویتـە (ثِقـل)یٚ (مـانِع)ی (صُعود)؛ (واقعاً) وایان لیٚ کـرد؛ گەرچـی خۆیـان بـە(مُوحّـد)ئـەزانن، (أمّـا) بـە (عدد)ی (رؤساء) (إله)یان هەیە، (کلمە)یان بلاّوە، یـەك نـاگرن مـن(قاعـدە)کـم دانـاوە، لـە(حقـائق)ی (إسـلام)یـم ورگرتیـە؛ هـەر(حُکـم)یٚ، هـەر(إعتقـاد)یٚ، یا(عمل)یٚ ئەگەر(إنسان)بلّندکا، (روح)ەکی(سعی) (عملی)بداتیٚ ئەوە لە(دین)ی

(إسلام)ە، ئەگەر(بالعكس)بیّ، (خارج)ی(أصل)ی (دین)ە، (داخل) كراوە ﴿وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ﴾ (كلمە)ی (طیّب)بلّند ئەكا؛ (یعنی) (كلمە)ی (طیّب) تەنیا (فائدە)یە وانادا، كەژین (رَفعة)و(إتّصال)ی ببیّ؛ (قول)ی چاك وپاك، لەگەلّ (عمل)ی (صالح) (إنسان)پیّ ئەگەیەنی؛ (حقیقة) ئەو (صعود)و (رفعەت)ە ، بۆ(صاحب)یەتی؛ و(علم)و (عمل) ویّكرا (أثر)یان نومایانە؛ (لكن) وەك (عرض) كرایە ئەبیّ بنۆرینە(عمل)ی(صالح). (فقیر)یّ ئاگری لەخانی بەریوە، هاوار هاواریەتی، (مسلمان)آن پیّ ڕانەگەن (مال)و منالّی(محو)ئەبیّ؛ لەو (وەقت)ە (حلقە)ی (ذكری)بگرن باشە؟ نا بەخوای زۆرخراپە؛ بە (ساعەت)یّ (موسولین) (٤٠٠) (طیار)ی ناردەسەر (ئەرنائوت)ان لەگەلّ (٣٥) هەزار (عەسكەر)؛ دوژمن وابە(قوەت)؛ ئیّمە خەریك بین (طیلسان)ی ڕیك خەین؟ كلی لەچاوان كەین؟ ڕندینی بەشانەكەین؟ ئای وای، (رؤسا )ی(دین)؛ چیان بە(دین)كرد! كوو هاویشتیانە(أدنی)ی(دركات)وای لەو(مَكر)ە؛ (سلب)ی (قُدرەت)و (قوەت)و (عقل)و (عمل)یان لە(مسلّمان)آن كرد؛ (آخر)ی وامان بەسەرهات؛ (ألآن)یش ئەوانی لە (إعتبار)دان، بە(غیر)ی(إفساد)ی (دماغ) بەچیدی (إشتغال)ناكەن؛ (عینا)وەكی (كوردی)ئەلّیّ:" (كفن)بە من ببڕیّ، مردی گۆڕبەگۆڕ چیّ! "(دائر)بە(سیّئات)ی(رؤسا )لە (حق) (دین)، بە(حق) ئەوەندەی بنووسی، كەمە، تەواو نابیّ ﴿وَالَّذِينَ يَمْكُرُونَ السَّيِّئَاتِ﴾ گەلیّ (مكر)ی خراپ ئەكەن؛ بە(تلبیس)ی(إبلیس)آنە، (خبیث)بە (طیّب)؛ (صالح)بە (فاسد) (تلبیس)ئەكەن؛ (باطل)ئەكەنە (حق)؛ (حق)ئەكەنە(باطل) ﴿لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ بە(نسبەت) (شدەت)ی (مكر)یان؛ ئەوەی خەریكی(مكر)ی(سّیء )بیّ، (كلمە)ی (طیّب)و (عمل)ی (صالح)ی نابیّ؛ (درجە)ی زۆر (منحط)و (دون) ئەبیّ ﴿وَمَكْرُ أُولَئِكَ هُوَ يَبُورُ﴾ بە(فساد)ئەچیّ؛ (كساد)ی بەسەردادیّ، بیّ (رواج) ئەبیّ، (تأثیر)ی نامینیّ؛ وەكی(إنكلیز)آن، (مكر)یان وای بەسەر هینایین، كەس پیّیان بڕواناكا، هەلّ ناخەلّەتیّ؛ (أمّا) (عذاب)ی خوای لە

سەروان بە (شدّەت)ە، (دائم)ە؛ لام وایە(مُقابلـە) لەگـەڵ (مكـر)ی (إلهـی)لێـرە (مُراد)نیە؛ گەرچی (مـلا)یـانی دی ئەفـەرموون: (لأمْكَرْنـا)هەرچـەند ئەوانـە بـە (مكر) بۆ كەم (عقل)آن ئەنوێنن، (بعث)نیە، (لكن) (جناب)ی(حق)بـە (حُجّـەت) (إثبات)ی ئەكا ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ﴾ (عناصر)ی(أصلیە)–(ذاتاً)– هەمووی (داخل)ی (أرض)ە ﴿ثُمَّ من نُّطْفَةٍ﴾ چۆن (تحوّل)ئەكا؛ (وهكذا) (طوراً بعد طَوْرٍ) ئەبێتە (إنسان) ﴿ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَاجًا﴾ (قسم)ێ نێر، (قسـم)ی مـێ یـاخود مێـرد وژن؛ ژن لە(نُطفە) ئاوس ئەبێ﴿وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَى﴾ (حتّی نباتـات)و (أشـجار) ﴿وَلَا تَضَعُ﴾ (حمل)دانانی ﴿إِلَّا بِعِلْمِهِ﴾ (علم)ی (عملی) (مقصود)ە؛ (حتّی) بۆ (وضع) چ (ترتیبات)ەكی داناوە؛ دانا تیای (مُتحیّـر)ە ﴿وَمَـا يُعَمَّرُ مِـن مُّعَمَّرٍ﴾ (عُمر) درێژ نابێ ﴿وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ﴾ لێی كەم نابێتەوە، یائـەوەی (عُمـر)ی كـورت ئـەبێ؛ وە(زێـد)ە و (نقـص) بـۆ (عُمـر)ی (شـخص)ێ (قابـل)ە؛ (لكـن) (مُتوقّـف)ە لەسـەر(بعـض)ێ(أُمـور)؛ (رعایـەت)ی (لازم)ە ئێسـتا (تـأمین)ی ئەكەن؛ (فقێ)یە لەمزگـەوتی ئێمـە، (ألعیـاذُ بـالله)تووشـی دەردێ بـوو؛ نێزێـك بوو، (نَفَس)ی ببڕی؛ دقتورێ لێرە بوو(ریاظ مخمرچی حلبی)؛ زۆر(حـاذق)بـوو، لـە(أمـراض)ی گـەروو و كەلّـە؛ (عملیـات)ی كـرد؛ خـوا كـردی (نجـات)ی بـوو؛ ووتی:" چارەگەكی پێ چووبا، ئەمرد"(أمّا)كە(واقع)بوو، ناگەڕێتـەوە. (واقعـاً) ئێمە ئومێـد مـان بەخوایـە؛ (أمّـا) (حُكمـا)ی (طبیعـەت) خـەریكن، بـۆ(عُمـر)ی (بَشری)، (زیاد)كردنی؛ (أمّا) (آفـات)لـە سـەر (بشـری) ئەوەنـدە گریوویتـەوە، چـارەی (مُشـكِل)ە ئەگـەر (مُحـال) نـەبێ. (واقعـاً) (عاقـل) لـە(عُمـر) كـورتی و درێژی (مُتحَیّر)ە؛ ئیـوا هەیـە، لـە(عُمـر)ی خـۆی وەڕزە، ڕەق و تـەق وچـاوكەم (حُكم)؛ بەڵكو كۆرو (فقیر) زۆر (عُمر)ی درێژ ئەبێ، نـامرێ؛ ئـاوا (دوام) ئـەكا ! یەكی تەن وەمەند، بە (قوّەت)و (حـاڵ)خـۆش؛ گۆنـا گـۆنی خۆشـی و (وسـط)ی (حیات)؛ ئەبینی ڕائەقەنێ، ئەڕوا؛ (سِرّ)ێكە، خوا نەبێ، كەس نایزانی. هەرچی هەیە، نیە﴿إِلَّا فِي كِتَابٍ﴾ بە(حق)؛ (كتاب)ە كەش خـۆی ئـەیزانی ﴿إِنَّ ذَلِكَ﴾

(نظر) به (عقل)، ئەو(عناصر)ە، (تطوّرات)بکا، ببێتە (إنسان)، بە(مُحال) (حساب)ە (علم)ی(محیط)–(کذلك)–(عقل)ڕێ نادا؛ (أمّا) ئەوانە ﴿عَلَى اللَّه﴾ لەسەر خوای ﴿يَسِيرٌ﴾ ئاسانە. (حقیقةً) وایە (صفات)ی (إلهی) (مُقتضا)ی (ذات)ە؛ (حاجەت)ی بە (کسب)و مَسب، نیە؛ وە پەکی بە(مُعاونە) ناکەوێ؛ (مُعارِض)ی نیە؛ بۆیە (عِلم)ی (شامل)ە؛ هەرچی (ممکن)بێ (قابل)ە بی هێنێتە (حَیِّز)ی (وجود)؛ شتێ(مُقتضا)ی (ذات)ی(کبریائی)بێ، بۆ(غیر)ی ئەو (مُحال)ە، (مُمتَنِع)ە؛ لە(قرآن)بگەن، باشە؛ بۆ خەڵکی خۆتان مەگۆڕن؛ قسەی (جاهلان)ە (قبول)مەکەن؛ (وَلَوْ )لە(مەلا)یە گەورە، گەورە، (نقل)کرابێ؛ (مُقتضا)ی (مقام)ی (أُلوهیّەت) (محافظە)بکەن؛ لێ ی بترسن، (تابع)ی (هَوا)مەبن (ذات)ێ وا (عالِم)و (قادِر) ناتوانێ (إعادة)ی ئێمە، لە(عناصر)ی (أصیله)مان، بکاتەوە؟ من(شُبه)م نیە، ئەتوانێ، وە ئەیکا(أمّا)کەی ئەیکا؟ خۆی ئەزانی؛ هەرچی بیڵێم لە (تعیین)ی(وقت)، (غلط)ە. (مع الأسف)، (مەلا)ی گەورە گەورە وەکی(سیوطی)؛ پێشی وی، دوای وی؛ زۆر (سهو)بووون (وکذا مع الأسف) ئێستاش، (عیسی)و (دجّال)و (مهدی) (أذهان)ی (مەلا)یان (مشوّەش) ئەکەن! ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ﴾ (بحر)ی شیرن و(بحر)ی تاڵ ﴿هَـٰذَا عَذْبٌ﴾ شیرینە؛ ﴿ فُرَاتٌ﴾ سووکە، (دافع)ی(عطش)ە﴿سَائِغٌ شَرَابُهُ﴾ خۆش گوارە؛ تختایی گەروو گیری نیە، زۆر خۆشە؛ وەکی ئاوی کانی(خاتوون)ی (چنارۆك)ێ ﴿وَهَـٰذَا مِلْحٌ﴾ سوورە ﴿أُجَاجٌ﴾ تاڵە، لەدەروونـدا گەرم ئەبێ، (عطش) (زیاد)ئەکا، وەکی ئاوی(کۆیە)گرانە؛ (هضم)نابێ﴿وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا﴾ گۆشتێ تەڕو تازە؛ (واقعاً)بەتازەیی، سووری کەنەوە زۆر خۆشە خواردنی؛ (أمّا)ئەڵێن:" (بصرەیی )هەڵی ئەگرنن تابۆگەنی نەبێ، نای خۆن " ئەو(فائدە) (فائدە)یە(عامّە)؛ ماسی(فوائد)ی (طبّی)زۆرە، (لکن)دۆزینەوەی، (مخصوص)ە، بە(أهل)ی (علم)﴿وَتَسْتَخْرِجُونَ﴾ لە هەردووکیان ﴿حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا﴾ (لۆلۆ)و(مەرجان)وابزانم(بحاث)ی(جدید)ئەڵێن:" ئەوانە لەئاوی

شیرینیش (تکوّن)ئەکەن" ئەفەرموون:" ئەو دوو(بحر)ە، (مثل)ی (مؤمن)و (کافر)ە؛ (بحر)ی تالّ(فائدە)ی هەیە؛ (غیر)ی خواردنەوە؛ (أمّا) (کافر) هیچ (فائدە)ی نیە" ئەگەر(مقعد) (فائدە)ی (قیامەت)بیّ؛ وایە؛ (أمّا) (فائدە)ی (دنیا)؛ تیّ(فکر)ە، بنۆڕە؛ (مصنوعات)ی(بشر)هەمووی لە(کافر)آن، پەیا ئەبیّ؛ ئەگەر(کافر)نەبان؛ پاپۆڕی (بَحری)، (سیارە)ی عەردی، (طیّارة)ی (هوائی) نەدەبوو؛ (تلفون)و(رادیو)نەدەبیسترا﴿وَتَرَى الْفُلْكَ﴾ ئەمڕۆ (سفینە)ی (شراعی)بیّ (قدر)بوە؛ وەکی کەڵەکی کوردان؛ بە(سعی) (کافران)آن، (بحر)پڕ بوون، لەپاپۆڕی(حربی)، (تُجّاری) ﴿فِیه﴾ لە(بحر)یّ؛ (فرق)ی شیرن و تالّی نیە ﴿مَوَاخِرَ﴾ ئاو شەق ئەکا. لە(دجلە)ی (بغدا)یە (ماتۆڕ)ئەمبینی، ئەڕوا؛ شوێنیّ لەئاو پەیا ئەکا، (بَین)ە کی پیّ ئەچیّ، ئەوجا ئاوجیّ ی خۆی ئەگرێتەوە؛ (ملّاح)ی (بحری)ئەمڕۆ (مُنحصِر)ە لە(کافر)آن ﴿لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِه﴾ (معامله)ی(بحری)باز لەگەلّ(کافر)آن؛ (بناءً علیه)فەرموو دەیان بەجیّ نیە؛ (مؤمن)و (کافر) (فائدە)یان هەیە؛ (أمّا)لە(ذات)ی خۆیان(فرق)یان زۆرە؛ (مسلمان)بە (أخلاق)ەبە(تربیە)یە بە(وفا)یە، بە(مُروّەت)ە بە(غیرەت)ە؛ لە(ذات)ی خۆی دا(کافر) (عکس)ی ئەو؛ (منفعەت)پەرستە؛ (خاصّةً)ئەمڕۆ گویّ نادەنە، (شرف)و (فضائل)ی(إنسان)؛ (مُؤْ مِن) (نعمەت)لە خوا ئەخوازی ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ (شُکر)ی خوای؛ (سُبحان الله) (مسلّمان)ان، (أوّل)ی (إستفادە)یان لە(بحر)کرد؛ دوایە لەسەر(سفینە)وکەڵەك مانەوە؛ ئاورووپایی گۆری یان، کردیانە(مراکب)ی(بخاری)؛ (مسلّمان)لە(بحر)پەکیان کەوت؛ دوایە لە(بَرّ)یش کەوتن؛ نا(شکر)ی نەبیّ نەچوونە(هَوی)تابزانین، چیان لیّ دیّ؛ ئێستا خەریکن (لکن)ئەکەون، خۆیان(معمل)ی شتی وایان نیە؛ (معمل)ی بە(قوەت)یان زوبانە؛ ئەو(آیە ت)ە زۆری تێدایە؛ (ضَرب المثل)ە، (آیات)ە، (آثار)ی (علم)و (قُدرەت)ە؛ (تنبیە)ە بۆ (قوم)یّ (قابل)ی (إنتباه)بی (سُبحان

الله) (أولاً) (إستیلا)ی(إسلامەتی)لە(أفریقا)و گەلیٚ(مواقع)بە (واسطه)ی (تجارەتی) (بحری)بوو، دوایە کەوتە دەستی(أجانب)! هەرچی هەیە؛ (جُمود)و (تقالید) ئەیکات ﴿یُولِجُ اللَّیْلَ فِي النَّهَارِ﴾ وانە بیٚ چەند(دەورە)یە، ڕۆژە، شەونیە ﴿وَیُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّیْلِ﴾ (کذلك)چەند (دەورە)یە شەوە، ڕۆژ نیە؛ (أنَّه)تیٚکدا، بزرئەبن﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ﴾ بە(قُوَّه)ی(قاهرە)ی خۆی ﴿کُلٌّ﴾ لە(شمس)و(قمر)﴿ یَجْرِي﴾(حرکە)ئەکا؛ هەریەك بە(نوع)یٚ؛ (حاجەت)بە جڵەوکیٚش نیە، نە(مَلَك)نە (ولی)﴿ لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾(آخر)ی(زمان)ی(دُنیا)تا ئەو ڕۆژە (جَریان) ئەکەن؛ دوایە(قوەت)یان نامینیٚ، یا (کالعدم)ی لیٚ دیٚ؛ (تعیین)ی (عائد)ی خوایە﴿ذَلِکُمُ اللَّهُ رَبُّکُمْ﴾ (غیر)یٚ (وزیر)یٚ نا﴿لَهُ الْمُلْكُ﴾ بە(خلق)و (إیجاد)و (وضع)و (جَری)و (تدبیر)و (تصرّف) ﴿وَالَّذِینَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِ﴾ (حتّی) (أقرب)و (أعظم)ی (ملائکە) ﴿مَا﴾ بە(معنی) (لا)مە ﴿یَمْلِکُونَ مِن قِطْمِیرٍ﴾ یەکی ئەڵیٚ:" ئەو پیٚستە تەنکەی کە (إحاطە)ی ناوکی خورما ئەدا" یەکی ئەلیٚ:" ئەو پوولەکەی بەسەری خورمایەوە" یەکی ئەڵیٚ:" تویٚکلی سیر" (خلاصە) (مالك)ی هیچ نین﴿إِن تَدْعُوهُمْ لَا یَسْمَعُوا دُعَاءَکُمْ﴾ گویٚ یان نیە، گویٚ یان لیٚ نیە.(سُبحان الله) (قرآن)لەگەڵ (معتقدات)و (آثار)ی دی، (فرق)ی زۆرە﴿وَلَوْ سَمِعُوا﴾ (بالعَرض)﴿ مَا اسْتَجَابُوا لَکُمْ﴾ (دعا)ی ئیٚوە (قبول) ناکەن ﴿وَیَوْمَ الْقِیَامَةِ یَکْفُرُونَ بِشِرْکِکُمْ﴾ (ملائکە) ڕۆژی (قیامەت) (تبَرّی)تان لی ئەکەن وەکی لە(سورە)ی(سابق)فەرمووی ﴿وَلَا یُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِیرٍ﴾ کیٚ هەیە وەکی خوا؛ ئاگاداری(حقائق)بیٚ؛ (خبر)ی (حقّ)و (حقیقة)بدا؟ ڕۆژی لەگەڵ (جمع)ی (محادثة)مان ئەکرد؛ (حسب المناسبه)وتم:" (آلآن)من ناتوانم، (شاهدی)بدەم، کە(حضره تی رسول الله)، یا(جبریل)ی(أمین) ئاگای لە (حال)ی منە؛ چی ئەکەم، چی ئەلیٚم؟ (أمّا) (شاهدی) ئەدەم (آلآن) خوا، (خبر)داری منە؛ ئاگای لە(مافی الصخیر)م هەیە" یەکی لە(صُلحا )وتی:" ئەمن (شاهدی) ئەدەم، کە پیٚغەمبەر(الآن)ئاگاداری (حال)ی ئیٚمەیە"گوتم:" کوو

(شاهدی) ئەدەی؟ (علم)ی (محیط) (شرط)ی(رسالەت)نیە؛ تا بلّیم:" ئەگەرئەو شتە نەزانی، (رسول)نیە" گەلەك شتیان (سؤال)لێ کردیە، نەیزانیە، (رسول)یش بوە؛ (أمّا) (خالق)ی (کُلْ )، ئەبێ ئاگاداری (کُلْ )بێ؛ (اُلوهیّەت)و (رُبوبیّەت) بێ (علم)ی (محیط) نابێ؛ من (مادام) (إیمان)م هەبێ، خوای منە؛ ئەبێ، (إیمان)م هەبێ، کە ئاگادارە، بە(حالم)"(بعد التّأمّل)ووتی:" بەخوای (إیمان)ی ئێوە لەگەلّ(إیمان)ی ئێمە(فرق)ی زۆرە"(یعنی) (إیمان)ی وان (تقلیدی)یە یا(مَیل)ە؛ کەم وایە، لە(دلیل)و(برهان)بێ﴿یَا أَیُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاء إِلَى اللَّهِ﴾ (سُبحانَهُ)لە(إیجاد)، لە(إبقا )ئێوە (إحتیاجی)تان بەخوای هەیە؛ ئەگەر دەولّەمەندیش بن، (فقیر)ن؛ (غَنیٌّ بالشّیْ، فَقیرٌ إلی الشّیْ)وەك (إمام)ی (شافعی)ئەفەرموێ:" (ولَیْسَ ألغِنی إلاّ عَنِ ألشَّیِ لا بِهِ) (سعدی) ئەلّێ: "آنانکة غنی تَرَند، مُحتاج تَرَند" ئێوە(محتاج)ی (إله)تانن، (مالك)ی هیچ نین؛ (غیر)ی خوا، کێ ئەمێنێتەوە؛ ڕووی تێ ئەکەن؟﴿ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ﴾ (حتّی) لە (خلق)و (إیجاد)تان؛ (بِألذّات) (غنی)یە؛ (إحتاج)ی بە هیچ نیە ﴿الْحَمِیدُ﴾ لە(مُقتضی)ی (مُعمی)و (لطف)و (کَرم)ی؛ (دەعوەت)ی ئێوە ئەکا، بۆ(إیمان) (بعث)ی (رُسل)ی لەبەر(مرحمەت)ە؛ بێ دەسەلاتی نیە ﴿إِن یَشَأْ یُذْهِبْکُمْ﴾ ئەتان با، ئەتان فەوتێنێ؛ نابووتتان ئەکا﴿وَیَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِیدٍ﴾ (مخلوق)ێ نوێ؛ چ یەکی لەسەر ئێوەو(خلق)ی نوێش ناکەوێ؛ گەلێ کەس ئەلّێن: "ئەکەوێ" یەکی وەکی(رافضی)یەکان، ئەلّێن:"(فلان)لەنگەری(أرض)و ئاسمان بُوەد" یەکی (آیة الله)"؛ وەکی(ناقَةُ الله)! یەکی :"شاهەنشاهی(عالَم)پەناە" یەکی: "(غوث الأنام)؛ (مُدبّر)ی(ذرّات)ی (کائنات)"یەکی:"وا" وەکی شوان و گاوانی چوونە ژێرخاك؛ چەرخ و(دولاب)ی (فَلك)وەکی خۆیەتی؛ یەکی لەسەر کەسی ئەوتۆ نەکەوتوە ﴿وَمَا ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ بِعَزِیزٍ﴾ گران و(صعب)نیە؛ وە(لازم) نیە، (خلق)ی (جدید) -(من حیث الخلق)- (أبداع)و (أحسن)و (أتقن)بێ؛ تا (مُنافی) بێ، لەگەلّ (قَول)ی (غزالی): "(لَوْکانَفی الإمکانِ أبْدَعُ مِمّاکانَ لَکانَ)"

(لکن) فەرموودەی (غزالی) لە (فکر)و (تأمّل)و (تعّمق) لە (أحوال)ی (کائنات) بە(قَدَر) (حوصلە)ی خۆی(صادر)بوە.(أمّا)لە(حقیقەت)دا، بۆ(إمکان)و (إمتناع)ی (ماهُوَ أبْدَعُ)، (عِلم)ێکی ئەویّ، وەکی (علم)ی (صانِع)ی (عالِم)، کەبە(حق)، (مُمکِن)و (مُمتَنِع)لێك کاتەوە؛ وە (ظاهر)ی (تطوّرات)ی (خلق)، لە(نقص) بۆ(کمال)–(تدریجاً)–(ترقّی)ئەکا؛ (قابل)ە(خلق)یّ گەلەك (أبدع) لەو (فضا)یە –(لاینحصر)ە–بێتە(عالَم)ی(ظهور) (مع أنّهُ) گەلیّ (أسرار)ی (فطرەت) هەبوو، لە(أیّام)ی (غزالی)لە (عالَم)ی (غیب)بوو؛ نەهاتبوە(عالَم)ی (شهود)؛ (إمام)بی دیبا، زێدە(دَهشت)و(حیرەت)ئەی گرت؛ ئەمەش باز لەسایەی (سعی) ئەوانی بوو، کە(مؤمن)ەکان، پیّ یان ئەلّێن:" (کافر)!" (حقاً) ئەوانە (خلق)ی (جدید)ن، (مُجَدِّد)ن؛ لە(عالَم)ی (صُنع)دا–لەسەر (أرض)ی –(خلیفە)ی(صانِع)ن؛ (أمّا مع الأسف) (مؤمن)ەکانی هەموو (ملّەت)، لەو (خلافەت)ە (محروم بوون) ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ کەسیّ بلّیّ: "بڕۆ، ئەوەی ئەی کەی بیکە؛ گوناهت بەئەستۆم، ئۆبالّت بە ملم"دیارە(وازِرة)؛ گوناهکارە، بەد (نفس)ە؛ ئەوانە(نوع)ە کن، لە(غُرور)آن؛ (صاحب)ی (عقول)ی (ضعیفە)، وە(میول)ی نا(ظریفی)پیّ هەلّ ئەخەلّەتێنن؛ لەریّ لایان ئەدەن؛ ئەیانکەنە (مُستخدَم)ی خۆیان. ئەوانەی (إمام)ی (ضلال)ن، پێشەوای گوڕانن، بە (قَدر) گوناهی (أتباع)یان (زێدە)ە لەگوناهی خۆیان، ئەیان هاویشت ترێتەسەری؛ بن بار (مُقابل)ی (ضلال)؛ سەرباز (مُقابل)ی (إضلال)! ﴿وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ﴾ هاوارکاتە فەریاد ڕەسیّ، بانگ و هاوارکا: "وەرە، (مُعاونەت)ەکم، کە" ﴿إِلَى حِمْلِهَا﴾ کۆلّیّ، باریّ؛ کە گرانی کردیە؛ لەبنیدا، داهاتیە؛ شتەکی، لەسەر هەلّ گریّ؛ کەمیّ بار سووك کا﴿لَا يُحْمَلْ مِنْهُ﴾ لەبارەکەی﴿شَيْءٌ﴾ (أدنی)یە ﴿وَلَوْ كَانَ﴾ ئەوەی هاواری ئەکرێتیّ ﴿ذَا قُرْبَى﴾ خاوەنی خزمایەتی بیّ، نێزیك بیّ، برای(شفیق)و(شقیق)بیّ. نەکەن (مسلّمان)نیە بەو (نوع)ە کەسانە (مَغرور) بن؛ (حتّی) ئەگەر (إعتقاد) بکەن، بە(جوازات)ی (أشعری)؛

(أمّا) (إعتماد)ی مەدە نەسەر؛ ((جائز)ە بۆ خوا، هەمووگوناه(عفو)کا)؛ (تمَام)! (أمّا) (لازم)نیە، ئەو (جائز)ە، بێتەجێ؛ وەهەم(جائز)ە، بۆ خوا هەموو (أعمال)ی چاکە بکا، بە(هَبا )؛ (أمّا)نای کا؛ (خلاصە) (سعی)کەن، بە(عِلم)و (عَمل)، لە(شقاوەت)ی (دنیا)و (قیامەت)خۆتان بپارێزن؛ وە(إلاّ)تێ ئەکەون،

پەشێمان ئەبنەوە؛

(نصیحەت) گۆش کون جانا

کی ئەزجان دوست تَر دارەند

جەوانانی (سعادەت)مەند، پەندی پیری دانارا)

ئەی(خلیل)ەکانم، خۆشەویستەکانم، ئاگاتان لەخۆبێ؛ (دائماً)ئەو دوو (رباعیە)ی (خیّام)ی بخوویننەوە، زۆر بە(قیمەت)ە، مایەی (نجات)ی (دنیا)و (قیامەت)ە:"

ئەی تازە جەوان بشنەو ئەزاین پیری کوهەن

این نُکتە کی ئەندەرۆ بوەد(مغز)ی سوخەن

یارێ کی دەرۆ (معرفەت)ێ نیست، مەگیر

کارێ کی دەر (منفعەت)ێ نیست، مەکون"

﴿إِنَّمَا تُنذِرُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالغَيْبِ﴾ لە(أوّل)ی(سورە)ی(بقرە)فەرمووی: "(قرآن) (هدایەت)ە، بۆ ئەوانەی بە(غَیب) (إیمان)بێنن" (قبل العیان) بە (إحتراس) ئاگاداری خۆیان ئەکەن؛ لە(وقوع)ی (فی المکارە)؛ (آمان)و (دەخیل) وانەکەن، (خراپ)تان بەسەردێ؛ دوژمن لە(کمین)ە؛ ئەمڕۆ سبەی دێتە سەرتان؛ (رەذیل)و (سفیل)و سەرگەردان ئەبن؛ (أمّا)گوێ ناداتێ، خەریکی (لَهو)و (لعب)ی خۆی ئەبێ، تائەی بینێ؛ ئەوجا: هاوار، ئامان، (ندامەت)، گریان. (قوم)ی(راقی)ترسیان لەهەزار ساڵ پاش ئەمڕۆ هەیە؛ لەوڕۆوە، خەریکی (أسباب)ی (صیانەت)ی ئەو(وەقت)ن؛ ئێمە نا(شکری)

نـەبیّ، نـە بـۆ (محافظـە )ی (دنیـا)نـە بـۆ (نجـات)ی(قیامـەت)، (عافیـەت) ئەندێشـیمان نیـە ﴿وَأَقَـامُوا الصَّـلَاةَ﴾ بـە هـەر تـەرزێ بـێ لـە (دیـن)ی خـۆی، (عبادەت)ی خوای بکا، (شخص) نەپەرستی ﴿وَمَن تَزَكَّى﴾ (نفس)ی خۆی پاك کا، لە (أخلاق)ی (رَدیّـە) (أعمـال)ی چـاك بکـا، فێڵـێ نـەکا، فێڵـێ لـێ نـەکرێ ﴿فَإِنَّمَا يَتَزَكَّى لِنَفْسِهِ﴾ (نفع)ی بۆخۆیەتی، (حیات)ی(دارَین)خۆی خۆش ئـەکا؛ ئەبیّ بە(عالم)؛ (ذات)ی گەورەی (نافِع)، بۆ (قوم)ی خۆی، بـێ(غـلّ)و (غـش)، (صالِح)و (مُصلِح) خوا (غنـی)یـە لـە(طاعـەت)و (تزکیـە)ی (أنـام) ﴿وَإِلَـى اللّـهِ الْمَصِيرُ﴾ (لا ألی غیرِ)؛ (تقدیم)ی (مَعمول) بۆ (حَصـر)ە (جـوهری) ئەفـەرموێ: "(حَصیر) (غـیر)ە (قیاسـی)یـە؛ (قیـاس) (مصـار)ە؛ وەکـی(معـاش)ە" ﴿وَمَـا يَسْتَوِي الْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ﴾ ئـەوەی (کـافر)ی بـێ(خێـر)ە، نەتـەنها کـۆری چـاو، کـۆری دلّ؛ (وَإلاّ) (طـە حسـین) کۆریشـە، (أمّـا) (بَصـیر)ە (واقعـاً) (قبلـە)ی (مصری)یانە؛ یـەکی تـریش هەیەلـە(عـراق) (مهـدی البصـری) ئـەویش شـایانی (تقدیر)ە ﴿وَلَـا الظُّلُمَـاتُ وَلَـا النُّـورُ﴾ (جهـل)و(علـم)؛ (باطـل)و (حـق)؛ (کفـر)و (إیمان)؛ (تقلید)و (إجتهاد)، (فی الحقیقـة) (تقلیـد) (عمـی)یـە، (ظلمـات)ە، لـە (جهـل) (خـراپ)تـرە (علـی العمیـاء ) (سـوق)ی (إنسـان) ئـەکا؛ بـۆ (أمـور)و (إعتقادیات)ی (غیر)ە (معقولە). (عقل)ی چی؟ (قبل کل شئ ) (نـور)ی (عقـل) ئەکوژێننەوە؛ ئـەوجا بـۆ (ظلمـات) (سـوق)یـان ئەکـەن؛ (خصـوص) (تقلیـد)و (ثِقە)ی (صوفی)یانە ﴿وَلَا الظِّلُّ وَلَا الْحَرُورُ﴾ (أکثر)ی سێبەر−(خاصـةً)سـایەی سبەینان− فێنکە؛ گەرمی باشە(أمّا) (شدّەت)ی−(خصوص)لەگـەڵ (سمـوم)− (خراپ)ە، (قاتِل)ە. لە (قاموس) ئەڵێ: "(حَـرور)بـای گـەرمی شـەوە" (واقعـاً) شەو بای گەرمی، زۆر ناخۆشە؛ (خصوص)لە (بِلاد)ی(حـارّە)؛ شـەوی گـەرمی بەگەرمەیا، (مثل)ە، بۆئەوانەی لـە(حـین)ی(أمـل)ی خۆشـی، ناخۆشـی بـدەن؛ لەسایەیان (شەو) ببیندرێ ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَحْيَاءُ وَلَا الْأَمْوَاتُ﴾ زینـدی و مـردی وەکی یەکدی نابن؛ (أثر)یان دیارە؛ (خصوص) بە(إعتقادیات)مردی، (مَحـو)ە.

(إنسان)یٚ (جماد)بپەرستی، لە(أموات)بەرە ژێرترە؛ (سُبحان الله)ئەو زیندیانە، ئەو مردیانە ئەمڕۆ چەند دیارن! (أقوام)ی(حَیَّە)و(أقوام)ی (میِّتە)؛ نازانیٚ (إنسان) چ بلّیٚ؟ (قرآن)و (دَعاوی) وی زۆر لێك دوورن؛ (أمـّة ت)و (قرآن) یەك ناگرن؛ ئەوەی سەیرە؛ لە (تلقین) ئەلّیٚ: "(سؤال)ت لیٚ ئەکەن؛ (إمام)ت؟ ئەبیٚ (جواب) دایەوە: "(قرآن)" (واقعاً) (إمام)و (مأموم)یٚ نالێك، هەریەك ڕوو لەلایەك ﴿إِنَّ اللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَاءُ﴾ ئەو ئەزانیٚ، کیٚ زیندیە، وەکیٚ مردی؛ کیٚ گوێی سووکە، کیٚ کەڕ؛ کیٚ(عاقل)ە وەکی کەڕ﴿وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ﴾ (ملا)ی (مُلَقِّن) زۆر ئەشیرینیٚ؛ تامردی گویٚ ی لیٚ بیٚ؛ (أنَّهُ)لە (رغم)ی (قرآن) (قوەت) ئەداتە خۆی؛ ئاگاشی لیٚ نیەیە؛ چ جایە مردی؛ زیندیەکان نای بیەن، تێی ناگەن! من گەلیٚ جار ئەلّیٚم: "برادەران، (تلقین)ی سەر(قبر)آن بۆ زیندیانە؛ تێی بگەن، بخوونن" (ملا) بە(سریانی) (تلقین)بە دا، کوردی بەستەزمان، لە (عربی) ناگا؛ (کەمرد هەموو شتیٚ فێر ئەبیٚ)؛ (تَمام)! خۆزی تازیندین شتەکتان زانا ندبا؛ گەر لە(ملا) (سؤال)کەی:" زوبانی(سریانی)چیە؟ چۆنە؟"(جواب)ی پیٚ نادرێتەوە؛ چ(قیدی)یە؟ (تلقین)بۆ کوردان، بەکوردی؛ (خطبە)ی (جمعە)نیە، (واجب)یش نیە؛ (سُنَّت)یش نیە؛ ئیتر بلّیٚم:"چی؟!" ﴿إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ﴾ (هدایەت)دان (عائد)ی تۆ نیە.(واقعاً)لە (تبلیغ)خوا ئەیزانی، زۆر (بلیغ)ە، زۆر تەواوە؛ ئەوەی ئەو کردی، بەکەس ناکریٚ ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ﴾ (رسالەت)یٚ بە(حَق)، بە(کتاب)ی (حق)﴿ بَشِيرًا﴾ وامەزانن، (بعث)ی (رسول) (حصر)ە، لە(إنذار)؛ (نظر)بە(حال)ی (مُعاند)آن؛ (إنذار) (أولی)و (أقدام)و (آکد)ە ﴿وَنَذِيرًا﴾ گویٚ لە(قرآن)کەن؛ ئەزانن(بشارەت)ی بۆ کێیە؟ (إنذار)ی بۆ کیٚ یە؟(شخصیّات)لە (قرآن)دانیە (سُبحان الله) خوا (أمر) ئەکاتە (رسول)ی (مُجتبا)، بە(إنذار)ی (عشیرەت)ی (أقربین)؛ وەبە (خفض)ی (جناح)، بۆ (أتباع)ی لە(مؤمن)آن. (رسالەت)ی بە(حق)، (إنذار)ی بە(حق)وا ئەبی ئەبا (رؤسا)ی (دین)و(دنیا) چاك تیٚ(فکر)ی یان﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ﴾ نیە ﴿إِلَّا

خلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾ (حتّـی)كوردیش؛ (أمّـا) (محافظـه)ی(دیـن)یـان نـەكرد. دیـاره (مقصد) له (أمّەت) (بشر)ە، باسی(حیوانات)ی تـر نیـه. (مماثلـه) لـه (بـین)ی (أنـواع)ی (حیوانـات)وه لـه(بَـین)ی(بشـر)_(مـن حیـث الـدین)وه (إرسـال)ی (رسول) نیه. (سّید)ی (آلوسی)ئەفەرموێ:" (قول)به (رسـالەت)ی (حیوانـات)و (بهائم)؛ لـه(غـیر)ی (شـیخ محـی الـدین)و (أتبـاع)ی نەبیسـتراوه" (ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ)، (بعـض)ە قسـەی هەیـه، بـۆ(أمّـەت)زۆر(خـراپ)بـوو؛ (حتّـی) دەرکەی (نُبوّەت) بۆ (هندی)یان كردەوە؛ (ممكن)ە بە(كرامەت)، (مقصد)ی له (بهائِم)، ئەوان بووبێ؛ (ذات)یٚ (صاحب) (كشف)بوه؛ (رسول)ێ لە(هندی)یـان بێ؛ وەچ له(بهائم) (فرق)یٚ چەندانی نیه؛ خۆزی پیاوی گـەورەو (نافـذ الكلمـه) بینۆڕییا، قسـەی خـۆی؛ بـۆ(أمّـەت)؛ قـازانج و (ضـرر)یـانی (ملاحظـه) كردیـا. (سیّدی آلووسـی) ئەفـەرموێ: "لـه(بعـض)ە (كتـاب)م چـاو پـێ كـەوتوه، ئـەو (قول)ە (كُفر)ە" (فَإنْ لَمْ يَكُن كُفْراً، فَضَرْبٌ مِنَ الكُفْرِ). ئێمـه(ثنـا)ی (شـیخ) ئەكەین، لامان زۆر گەورەبوه؛ زۆر(مسلمان)و(مؤمن)یٚ (كامـل)بـوه؛ (مـع هـذا) قسەی (مخالِـف)ی لێ(قبول) ناكەین ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ لـه(أُمَـم)ی ڕابـردوو؛ (ذاتـاً) (قاعـده)یـه ئـی نـوێ، (إلّا) (جمـع)یٚ (قَـدح)ی لـێ ئەدەن، (إستكراه)ی ئەكەن، خـەریكی(إمحـا)ە ئـەبن ﴿جَاءتْهُمْ رُسُلُهُم﴾ هـەر (قوم)ە (رسول)ی خۆی؛ (قـوم)ی (معلـوم)و (غـیر)ە (معلـوم)؛ (ذاتـاً) (قـرآن) (صـریح)ە، هـەر (قـوم)ە (رسـول)ی خـۆی بـوه؛ (رسـالەت) (خـاص)نیـه، بـه(شـعب)یٚ؛ (حقـاً) وایـه، (مـادام)خـوا لـەڕووی(لُطـف)بـۆ(هدایـەت) (رسـول) ئەنێری، ئەبێ بۆ هەموو (ملّـەت)بنێـری. (أقصـی)ی (شـرق)ێ ئاگـای لـه (بنـی إسرائیلی) هەیه؛ بێ، (إیمان)به (رسول)یان بێنی؛ با(وجود)ی (مُكلّف)نـین. لـه (رسول)ەكان به (عموم)ی (دەعوەت)و (تبلیغ)، نه ئەمانه به هـاتن؛ لەوسـەری (دنیا) بۆ ئەم سەری(دنیا)؛ ئـەو(رُسـل)آنـه هاتنـه سـەریان، لـه(طـرف) خـوای نـاردران ﴿بِالْبَيِّنَـاتِ﴾ (معجـزات)و (بـراهین)ی ئاشـكرا ﴿وَبِالزُّبُرِ﴾ وەك:

(صُحف)ی (إبراهیم)؛ (زُبُر)ی (داود) (علیه السلام)؛ (مُناجات)و (أناشید)ی (روحی) ﴿وَبِالْكِتَابِ الْمُنِيرِ﴾ (حاوی)بەسەر(علم)و(أحکام)ی (إعتقادی)و (أعمالی) پاك وڕوناك؛ ڕوناك كەرەوە؛ (هادی)بۆ ڕێ ی ڕاست، بۆ(سعادەت)ی (دارین) ﴿ثُمَّ﴾ پاش (مُدە)یە–کە(معلوم)بوو– ئەوانە(عِناداً) (إیمان)نایەنن؛ (قابل)ی (إصلاح) نین ﴿أَخَذْتُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ لەبەر(کفر)یان، (شخصیّات)، نالە (قرآن) (توجّە)ی ئەو(نوع)ە (حُکم)ە، بۆ(ماصدق)ی (عنوان)ە؛ (خصوصیّەت) (فلان)و (فلان)ی نیە ﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ (إنکار)ی (جناب)ی (حق) لەکردەوەیان و(عاقبەت)ی، چ بوو؟ چۆن بوو؟(هلاك)و(إمحا)و (عذاب)و (عقاب) ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ (أیّها الرائی)ئەو(آیات)ە (بَیّنات)ەت نەدیوە؛ تێی نە(فکر)یوی؟ ﴿أَنَّ اللَّهَ﴾ ئاشکرایە، ئیشی خوایە﴿أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾ باران ﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِ﴾ بە باران، بەئاوەکە–(بعد الأنبات)– یاخود(کلام)، (نظر) بە(حال)ی گەیشتنیانە، لە(زمان)ی بەرداری﴿ثَمَرَاتٍ﴾ لە(أنواع)ی دار؛ سێوو قەیسی، توو وهەنار، ئالی بالی و هەلووچکە، هەرمێ و کرۆسك بەأقامی، بەهێ و ترێ و هەنجیر، لیموو پرتقال و کەبات و مسکی و نارنج و ترنج و خورما ﴿مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا﴾ (أنواع)یان؛ (أکثر)لەو(أنواع)ە (أنواع)و(أصناف)ی هەیە؛ هەرمێ چەند(نوع)ی هەیە؛ (نوع)ی شیرینی چەند (صنف)ی هەیە؛ هەمووی شیرینە کەچی؛ (ذوق) (فرق)ی شیرینیان ئەکا؛ (وهکذا)هەنارو قەسپ و ترێ؛ وە هەم ڕەنگیان (مختلف)ن و(خواصّ)یان تەماشای (کُتُب)ی (طِبّی)کە، لەباسی (خواصّ)ی (نباتات)و(ثمرات)؛ (أوّلاً) (حیات)لە(نبات) (ظاهر)ئەبێ؛ وە (إختلاف)ی ڕەنگیان بۆ(جلب)ی (نظر)؛ تاجوان بێ؛ بێ بینێ بێ خوا. (حُکما)ی (کرام) (بحث)یان لە(نباتات)و (أشجار)کردیە؛ چەند(قُوا)ی (عامِلە) هەیە، تێ یاندا (موجود)ە؛ (هاضمە)، (ماسِکە)، (غازیە)، (جاذیە)، (نامیە)، (دافعە)؛ (جلب)ی (غذا )بە(صورەت)ێ (عجیب) ئەکا؛ (عُلما)ی (جدید) (زێد)ە، (توسیع)یان داوەتێ؛ (وقعاً) (بَحّاث)ە کانی(بشری)ش (آیات)ن

(آیات)ی (کَون)یان بە(سعی)و کۆششیٚ(مُحیِّر العقول) (تحمّل)ی قورسی دەرخستوە؛ مەراقیان، (دوام)یان، (تعقیب)یان، (اختراع)ی (آلات)یان، هەمووی (آیات)ە (سعدی)ئەفەرمویٚ:

" بەرگی درەختان سەبزەست، دەر(نظر)ی هوشیار

هەر(ورقە)یە دەفتەریت(صنعەت)ی پەروەردگار"

بەلیٚ هۆشی ئەویٚ، (أمّا) (نظر)ی (علم)ی (عملی)بە (فائدە)یە، (ثمر)ی زۆرە. (ثمرات)و (ذی ثمرات) (مُرکّب)ن لە(معادن)ی (عناصر)ی (مختلفە)﴿وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ﴾ دەمار، دەمار؛ (طبق) (طبق)، (خط)، (خط) (إمتدات) ئەکات ﴿بِيضٌ﴾ سپی وەکی گەچ، قلْ، بەردی حەلانە﴿وَحُمْرٌ﴾ سوور؛ دەماری شاخە سوورەی هەیە﴿مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا﴾ سپی وسوور، بە(إختلاف)ن؛ (بعض)ی (مائل) بەزوردی، (بعض)ی (مائل)بە کەبوودی وەکی(أنواع)ی مەرمەر. ئەوجا بنۆرە لە(أحوال)ی(معادن)؛ چیایان بکۆلە، عەردان هەلْ کۆلە؛ تووشی (طبقات) ئەبی، (إستفادە)ی (مادّی)و (معنوی)لیٚ ئەکەی؛ ﴿ وَغَرَابِيبُ سُودٌ﴾ پارچە پارچەی قیرژەیە؛ وەکی(فحم)ی (حجری)و (شجری) (سُبحان الله)ئەو قیرژەیە، لە(چنارۆك)ی ئێمە، لە(طرف)ی شینکان؛ دەمار دەماری ئەو بەردە قیرژەیەیە، لیٚ دەرئەکەویٚ؛ نەختیٚ لەدوور ئەی نۆڕیە، (عیناً)ئەلیٚ ی قەلن، بە ریز هەلْ نیشتوونە؛ چونکی (قطعە قطعە)یە، وەکی بەردی دی(مُتّصل)نیە؛ (آیەت)ئەبی، بەجیٚ(تفسیر)کریٚ؛ (أمّا) (تفسیر)ی بە(جادّە) (یعنی)ریٚ، لیٚرە بیٚ جیٚ و ڕیٚ یە (کشف)ی ئەو (معادن)ە، (إستفادە)لیٚ کردنی، بە(علم)ی (حکمت)ی (طبیعی)ئەبی؛ (أمّا) (علم)ی (مع التجربة)، و(مع العمل) وەکی ئاوروپایی یان. (مع الأسف) (مسلمان) (محروم)بوون، وە(محروم)ن لەو (کُنوز)ە؛

((ملا)ی نادان بە(عنوان)ی (شریعەت)

(حرام)ی کرد لەتوو(علم)ی(طبیعەت)

له بۆیه هەرچی لەو(أرض)ە به دەرکەوت
لەزێڕو زیوو پۆلاً وو پاقل و نەوت
بە(کُلّی)کەوتە ژێر دەستی فەرەنگان
چیاو چۆلان دەنۆڕن وەك پلنگان
بیان نۆڕیٚ چیایان چۆن ئەکۆڵن
هەتا کەی ئێوە هەر بەرماڵ بە کۆڵن؟)

﴿وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ﴾ ئەم(عالَم)ی(حیوان)ە بنۆڕە؛ (جنس)یٚ بەچەند (فصول) (مُختلِف)ە؛ (ماهیات)ی (مختلفە)ی لیٚ پەیابوە؛ وە(کُلّ)ی (نوع)یٚ، بە(عوارضات)ی (شخصیّە) چەند(ملیار)و(ملایین) (أفراد)ی هەیە. ئەو(أفراد)ە لەژێر(أصناف)ی(مختلفە)یە ﴿كَذَلِكَ﴾(إختلاف)ی ئەمانە، وەکی (أختلاف)ی (مذکور)ە، لە(أشجار)و· (معادن)؛ (أختلاف)ی (ألوان)ی (حیوانات)، (منشأ)ی (أختلاف)ی (ألوان)ی (نباتات)و (معادن)ە؛ (أصل)ی (ألوان)یش لەرۆژە؛ رۆژیش بە(بقاع) (آثار)ی ئەگۆڕی﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ هەر(عُلماء)لە خوای ئەترسێن؛ (عُلما)ش (مختلف)ن (بعض)یٚ (نحوی)ن، (بعض)یٚ (صرفی)ن؛ (وَهکذا)؛ (أمّا) (عِلم)ی (قیل و قال) (خوف)نادا؛ (ذاتاً) (علم)نین، (مُقدّمات)ن، بۆ (علم)ی (نافع)؛ (علم)ی(نافع)؛ (علم)ی (صانعیّەت)ە، (علم)ی (طبیعە ت)ە؛

(عِلم)ی (طبیعە ت)، (عِلم)ی خودایە؛
(قال)و(قَول)ە گشتی (هَبا)یە؛

بەلیٚ کەسیٚ(إیمان)ی بەخوا هەبیٚ، (أسرار)ی (کائنات)، (دقائق)ی (صُنع)ی (إلهی)بزانی، (جلال)و(عظمە ت)ی خوای، (أستیلا)ی بەسەردادەکا؛ بە(حق)دادەکا؛ بە (حق)لیٚ ی ئەترسیٚ؛ کە ناوی بێنی، (زلزلة)ی ئەکەویتە (بَدن)؛ ترسی وی (خیالی)و (وهمی)نیە؛ (عملی)و (حقیقەت)ە؛ ترسی (تبجیل)و (تقدیس)و (تعظیم)ە؛ (فقیٚ)تیٚ گەیشتی، کە (درجە)لا(علم)ی مامۆستای خۆی

تێ گەیشت، وا (هَیبەت)و (سطوەت)ی (ملایی) (إستیلا)ی ئەکا؛ ئەوەندەی لێ ئەترسێ، ئەوەندەی شەرم لێ ئەکا؛ کە (دهشەت)ی پێ ئەدا؛ (جاهل)ێ تەك بە تەکی دادەنیشێ، گوێشێ ناداتێ؛ (قَدر)ی نازانی؛ وە (مَرحبا)شی لێ ناکا؛ (ملای)ی (طبیعي) (إیمان)ی بە خوای (صانع)ی (عالم)، زۆر بە (قوەت)ە؛ (خرافات)هەڵناگری؛ لەبەر (خرافەت)ی (نُقّال)آن؛ (إیمان)یان بە (أدیان)و بە (رُسل)نەماوە؛ نیە (مع الأسف) (عُلما)ی (سوء)وایان تێ گەیشتینە؛ (علما)ی (دین)لەسەر (إنکار)ی (طبیعة)ە؛ ئی (علمای) (طبیعة) لەسەر (إنکار)ی (شریعەت)ە؛ ئەگەرخودا (کَرَم)کا (ملا)، (ملا)ی (شریعەت)و (طبیعة)بێ، خۆیەتی؛ (فائدە)ی (دارێن)ی ئەبێ؛ (لکن)کەمن، یان نین ئەو (آیات)ی (کریمە)، وەکی (معلوم)ت بوو، (مفتاح)ن، بۆسێ (علم): (علم)ی (نبات)، (علم)ی (معدن)ە؛ (منشأ)ی (حیوان) (نبات)ە؛ (حُکمای)بەو سێ (علم)ە، خەریکن؛ قانزاجیان کرد، بەسەرکەوتن (حُکما) (إیمان)یان بەخوا هەیە؛ (أمّا) تەماشای (علَل)و (أسباب)ی (قریبە)ئەکەن؛ (سبب)ی (قریب)ی (إختلاف) ئەدۆزنەوە؛ (حُکما) (إیمان)یان بە (صانع)ی (عالم) هەیە (أمّا) تەماشا ئەکەن، (صانع)چۆن ئەو (مصنوع)ە ئەکا؟ تالێ ی فێربن، ئەوانیش (صُنع) بکەن؛ (حُکما) (تلمیذ)ی خوان؛ (حُکما)مِن (تغیر)یان بە (رسول)ی (طبیعت) ئەدەمەوە. لێرە (عُلما)ی (تصوّف) (مُراد)نین؛ (خوف)یان، (کشف)یان، لە(عالم)ی (وهمیّات)و (خیالات)ە؛ (کشف)ی (جابُرسا)و (جابُلقا)؛ لەگەڵ (کشف)ی (أمریقا) ئەوجا ئەزانی، بێ (نفع)، بە (نفع)چیە؛ (فرق)ی چەندە؟ ناتۆرِنە (قرآن)، تەماشای (لوح المحفوظ)ئەکەن ئەوەی بە (خیال)تیای ئەبینن، بێ کەڵك و (وجە)، بەڵکو (مُضِر)ی (دنیا)و (قیامەت)ە. (واقعاً) (صُلحا)یەکانیان گەلێ باشن، (أمّا)ئەو (مَسلك)ە، لەگەڵ (أساس)ی (دین)ی (إسلام)رێك نەبوو؛ (حفظ)ی (دین)ی (إسلام)، زۆر پێ ئەوێت ئەمڕۆ زۆرتریش

پێ ئەوێ، (لكن)، چوو؛ (رؤسای)ی (سوء) (دین)یان گۆڕی؛ لە (میادین)ی نەبەردو مەردی، گێڕانەوە، بۆ ژێر زەمین؛ (آخر)ی ڕۆ چوون؛ بۆیە (قرائەت)ی (رفـع)ی (الله)كـە (فاعـل)بـێ، بـۆ (یَخشـی)؛ (معنـاً) (مَقبـول)ە ئەگەرچـی (قرائەت)ێ (شاذ)ە، زۆر (شاذٌ)ە، زۆر نا (معقول)ە (واقعاً)جێ ی ترسن، (ذاتاً) (أدیان)ی (سماوی) (ملا)یان گۆڕیان؛ (رؤسا)ی (لاهوتی)و (ناسووتی)، تێكـان دان ئیتر ئەوەندە بەسیە ﴿إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾ لەبەر (غفران)یە (إمهال)ی ئـەو (جهـلات)ە ئـەدات؛ (قیـل)ێ هەیـە كەئـە (آیـەت)ە، لـە (حـق) (أبـی بكـر) (نـازل)بـوە؛ بـەڵێ (صِـدّیقی) (مِصـداق)ی (آیـەت)ە، لـە خـواترس بـوە؛ بـەڵێ لەترسـی خـوا، گریـاوە؛ (أمّـا) (آیـەت) (حاجـەت)ی بـە (سـبب)ی (نـزول)نیـە؛ (عُلما)ی ڕاستی، (یعنی)لە (رؤسا)ی (سیاسی)نەبێ، لە خوا ئەترسێ؛ وردو لـە (جهەت)ی خواناكا؛ خوا بانگی كردم:" أيّهـا العـالم الكيـبر، والمجتهـد الأعظـم" ئەوە لە لایان نیە؛ لەبەر (خوف)ی خوارەوە بـێ درۆیـی (آخـر)ی ئـەو (فرقـە)، بێ (حرومەت)بوون؛ ئەوانی درۆزنی لە خوا نەترسـن؛ بوونـە (رأس الكّـل)ی (فی الكل)، (أمّة) (سجدە)یان بۆ دەبـەن﴿إِنَّ الَّـذِينَ يَتْلُـونَ كِتَـابَ اللَّـهِ﴾ هـەردووك؛ (قولی)و (فِعلی)، (لفظي)و (كونی)؛ ڕەش خوونی (قید)ی نیـە؛ بـۆ (عـوام)خێـر بێ؛ (أمّا)بـۆ (مـلا)یـان، (خێـر)لـە زاتیـی و (تطبیـق)ی دایـە. مـن ئـەو (بَـین)ە (درس)ی (تفسیر)ئەڵێم: ئەمڕۆ لە (سورەی (آل عمران) (درس)مـان (أدی)كـرد؛ زۆر جار بە (جماعەت)ی (فقێ)یەكان ئەڵێم: " (تفسیر)ی (قرآن)وەكی باغێكە، هەموو (نوع)ە میوەی تیابێ؛ لەم دەچی بۆ ئەو لەو ئەچی بـۆ ئـەم؛ هەریـەكی (لـذەت)هەیـە. بـۆ (أربـاب)ی (ذوق) (حقیقـةً)وایـە؛ وەئـەوەی (علـم)ەكـی زۆر (محـیط)ی نـەبێ، ناتوانـێ بـە (حـق) (دەرس)ی (تفسـیر)بـدا؛ وە (علـوم)ی (عصریە)ش زۆر پێ ئەوێ ﴿وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ﴾ بـە (حـق)بـە جـێ ی ئەگەیـەنن، (إمتیان)نادنە خۆیان، گۆیا ئەوان، (خواصّ)ن؛ (خـواصّ الخـواص)ن، (ذوات)ی گـەورەن، كـوو لەگـەڵ (عـوام) (عبـارەت)ێ وا (مبـذول)بكـەن؟ ﴿وَأَنفَقُـوا مِمَّـا

رَزَقْنَاهُمْ﴾ (طبیعی)لـه (حـلال)ی (إنفـاق)ئەکـەن؛ بـەڵێ (حـرام) (رزق)ە - (مـن حیث الخلق والإیجاد)با (من حیث الشرع) (بعض)ێ پێ نەڵێن: " (رزق)" ﴿سِرًّا وَعَلَانِيَـةً﴾ تەماشـا ناکـەن، لێـك نادەنـەوە؛ (دغدغـە)یـان بـە دڵ دابـێ وابکـەم (ریایی)یە؛ بە دزی چاترە)؛ بـەڵێ جـێ ی (إنفـاق)ی (سـری)جودایـە لەگـەڵ (إنفاق)ی (علنی)؛ کەسێ مزگەوتـەکی دروسـت ئـەکا، (کُتُـب)خانەیـە دادەنـی، چـۆن بـەدزی ئـەکرێ؟ بـەڵێ گـەلێ کـەس لـە (جهالـەت)ەوە، نـاوی خۆیـان و (تأریخ)ی (بنا)ی (مسجد)نانووسن؛ دوایە لە (فکر)ئەکرێن؛ (حقیقە) (خیـاڵ)ی (باطل)ە؛ (حضرەتی خلیل الرحمن)، (دُعـا)ی (بقـا)ی نـاوی خـۆی کردیـە؛ نـا (شکر)ی نەبێ، ئەو (جملە) (ملا)یەی خوا لەم (عصر)ە، (إخراج)ی کرد؛ (علـی الأکثر) (فقیر)ن، چاویان لەدەستی خەڵکی یە؛ ئـی دەوڵەمەنـدیش، کـەم وایـە، بۆ خـوا لـەرێ ی (علـم) (إنفـاق)بکـا؛ چـەند خـۆش بـوو، (أربـاب)ی (قـوەت)و (ثروەت)ببنە (ملا)؛ بـە (قـوەت)ی (مـادّی)و (معنـوی) (خدمـەت)ی (دیـن)یـان کردبـا؛ ئـەوە (وەقـت)ە (علـم)و (دیـن)قـەت بـێ (قـدر)نـەدەبوو. (ذاتـاً) (عُلما)گـەورەکانی (سـلف)ئـی نامـدار - هـەموویان (أربـاب)ی (مُکنـەت)بـووین، دەوڵەمەنـدی (دنیـا)و (قیامـەت)بـووین؛ (مـلای) (فقـیر)ی بـێ دەسـەڵاتی، بـێ (أحوال)؛ چی لەمسـت دێ؟ خـۆی پـێ بـە خێـو نـاکرێ؛ خـاوەنی (دیـن)چـۆن ئەکات؛ ﴿يَرْجُونَ﴾ بە (تِلاوەت)و (إقامـە)و (إنفـاق)﴿تِجَارَةً﴾ (معاملـە)لەگـەڵ خـوا ﴿لَـن تَبُـورَ﴾ (کسـادی)بەسـەر دانایـە، ناشـکێ تـێ ناشـکێ ﴿لِيُـوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ﴾ (تجارەت)یان لای خوا بە (رواج)ە، بەتەواوی (أجر)یان پێ ئەگەیەنێ ﴿وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِ﴾ (إستحقاق)لە (عالم)ی (تشریع) (إنکار)ناکرێ؛ (نظـر)بـە (إستغنا)ی (کبریائی)کەی، چی لەسەر (واجب)نیە، کەس (حقّ)ی نیە. (نزاع)ی (سُنّی)و (مُعتزلی) (إعتباری)یە؛ (نفی)و (إثبـات)بـۆ جـێ یـە ناچـی ﴿إِنَّـهُ غَفُـورٌ شَكُورٌ﴾ (ممکن)ە (ذات)ی (شُکر) (کەس) بە (صـاحب)ی نـەزانی، بـەڵام ئەمـە (شُکران)ەی خوایە، بۆ (عباد)ی خۆی؛ بە (معنی) (زیادی) (أجر)ە؛ (زیادی)لە

(أجر)ە؛ (ترغیب)لەمە بە (قوەت)تر نابێ (أنَّهُ) (إنسان)ی باش، ئەبێتە (مُنعِم)، (جناب)ی (حق) (شُکر)ی ئەکا؛ (تعّجب)ئەکەم لەو کەسانەی (عمل)ی (صالح)یان لا بێ (قیمەت)ە؛ (مع أنَّهُ) (قیمەت)ی (إیمان)بە (عمل)ی (صالح)ە. (مؤمن)ی (خراپ)ی بێچاکە؛ بۆچی چاکە؛ چ کەلکێکی پێوە هەیە؟ ﴿وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ﴾ لە(قرآن)ی (حکیم)﴿هُوَ الْحَقُّ﴾ هەر ئەو (حق)ە؛ بۆ (روایات)مەی گوێن؛ بۆ (خاطر)ی (عمرو)و (زید)خۆتان مەکەنە، دوژمنی (حق)؛ (دین)ی خۆتان، (کتاب)ی خوا، بۆ (نفع)ی (شخص)ێ مەدۆڕێنن؛ خۆتان مەکەنە، (خسارەت)مەندی (دنیا)و (آخرەت)، درۆ بۆ(ملا) (نفع)ە بۆ (شێخ)ی وەی (خسارەت) مەندی(دنیا)و (آخرەت)، بەناوی (ولایەت)خۆی (کافر)ئەکات؛ (عرض)م کردن؛ (ملا)لە خوا ئەترسێ، درۆ ناکا، وایە؛ (لکن مع الأسف) (بعض)ێ هەن، لە خوا نەترس؛ بۆ خەڵکی درۆ ئەکەن، بۆ خەڵکی درۆیانن( قبول)ئەکەن؛ (ترویج)ی ئەدەن، (عالَم)ی (إغوا)ئەکەن؛ (حقیقە) (تجارەت)ێ بێ (فائدە)؛ بەمایەو قانزاج تێ ئەشکێ. تا ئەتوانن (تمّسك)بە (قرآن)کەن بە (قیل)و (میل)مەخەڵەتێن؛ (عاقبەت) (وخیمە)﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ بە (نوع)ێ کە ساغ و چروکی لێك ئەکاتەوە. (بَیان)ئەفەرموێ: " (تورات) (مُحَرّف)کرایە" وایە؛ بنیۆڕێ (ترجمە)ی (عربی)، (فارسی)؛ (حتّی)پار بە (کوردی)ش (ترجمە)و (نشر)کرایە؛ (إنجیل)زۆری (نقل)کرایە، لە (ناقل)آن؛ (ذاتاً) (إنجیل) (تدوین)نەکرایە؛ (حواری)و ئەوانی دوایە، بە (نوع)ی (سِیَر)شتەکی ئەڵێن:" ئەوە (إنجیل))ە" هیچی بەوەناچێ، کە (وحی)ی (إله)ێ بێ؛ بۆ (رسول)ی ناردبێ. وە (تصدیق)ئەکا؛ گەلێ لە (نوات)ی دی، (رسول)بووین؛ (کتاب)یان بوە ﴿إِنَّ اللَّهَ بِعِبَادِهِ لَخَبِيرٌ بَصِيرٌ﴾ ئەزانێ، ئەوانی پێشی چیان کرد؛ ئەو (کُتب)ی (أدیان)ە، کوو (فەوت)آن؟ کێ (تحریف)و (تبدیل)و (تأویل)ی بێ (معنا)ی کردن؛ وە بۆچیان کرد؟ ﴿ثُمَّ﴾ پاش ئەوانە ﴿أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ﴾ (قرآن)ی (حق)﴿الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ

عِبَادِنَا﴾ (قرآن)مان به (میرات)دانێ؛ (لازم)نیه، (قرآن)بۆ وان هاتبێ، لەوان ڕا درا بیته (مؤمن)آن؛ وه (معلوم)ه (تورات)و (إنجیل)دراوەته (مُؤمِن)آن. ئەگەر (إضافه)بۆ (تشریف)بێ، (وکذا) (إصطَفا)، (إصطفی)ی (تعظیم)و (تکریم)بێ ﴿فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ﴾ نابێ، به (مُنافق)یا (فاسِق) (تفسیر)کرێتەوه؛ کەسێ - (وَلَوْ) (إیمان)ی هەبێ - کەلە (عبدی)وەکی (کافر)آن، یا (خراپ)تر بێ - چ (إصطفا)یەکی هەیه؟ (وکذا)ئەگەر (مُراد) (عُلما)بێ، (خیار)ی (أُمّەت)، (حُفاظ)ی (کتاب)، (تخصیص)ی به (عُلما)ی (آلُ بیت)، بێ (معنا)یه. (واقعاً)له (ملا)یان، (إنسان)ی (فاسق)و (فاجر)و (مُضّل)و (مُغوی)هەیه؛ (أمّا)ئەوانه (مُنسلخ)ئەبن، له (آیات)؛ کەوابی ئەڵێن: " (قسم)ی لەو (عباد)ه، له (نفس)ی خۆی (ظُلم)ئەکا؛ بۆر (رهبانیّەت)ئەچی؛ (لذائذ) (حرام)ئەکا، (نفس)ی خۆی (غایەت) (عذاب)ئەدا ﴿وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ﴾ له (بین)ی (لذّەت)ی (حیات)ی (دنیا)وه (سعی)بۆ (آخرەت)؛ لەویش (إستفاده)ئەکا وه (قیامەت)یش (غافل)ناکا﴿وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ﴾ (أنّهُ) (خیرات)پێش ئەخا؛ ئەوەی (خێر)بێ، (موافق)ی (حال)و (وقت)بێ، ئەوەی ئەکا؛ ئەوه زۆر گرانه، (ڕەحمەت)ه بۆ کەم کەس (مُیَسّر)ئەبێ؛ بۆیه به (خصوص)ی ئەفەرمووێ:" ﴿بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ به (تیسیر)و (تسهیل)ی خوا. (بناءاً علی هذا)﴿ذَلِكَ﴾ (إشاره)بێ، بۆ (ماتَقدّم)له (إراث)و (إصطفاء)زۆر جوانه. ئەگەر (ظالم) (حمل)کەنه سەر گوناه پیشه؛ (مقصد)گاهی (موافق)، گاهی (مخالف) (محیوراً) (ذَلكَ) (إشاره)ئەکا، بۆ (قسم)ی (ثالث)وه (حقیقةً)ئەبێ؛ زێرا ﴿هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ﴾ (إلی آخرِهِ)لەوان ئەوەشێتەوه. (إیمان)ی بێ (ثمر)بەڵکوو، (مُثمر)به (خلاف)ی (مأمول)؛ ئەگەر (فصل)ەکی هەبێ، (أمّا)بەو (درجه)نیه. وه (ممکن)ه ببێ به (طوق)له (ملی) (صاحب)ی؛ (قیل قیل)یان له (بیان)ی (أقسام)ی (ثلاثة)له چل (متجاوز)ه؛ گەلێکی پڕو پووچ و بێ (فائده)یه، بۆ ئەوانەی (مُستحقّ)ن. (إنسان)نازانی ئەو هەموو (إختلاف)ه چیه؟! (نزاع)ی

(أشاعِره)یاخود (سُنّی)و (معتزلـه) (دائماً)بـەر پایـە؛ هـەردوو بەیـەك ئـەڵێك:" (أصـحاب)ی (بِدَع)و (أهـواء)" هەرچـی هەیـە کەسـێ بـە (إنصـاف)تەماشـای (أمّة)کا، ئەزانێ، (فاسق)ەکانی (مؤمن)، بۆ (دین)و (دنیـا)، بـۆ (إسـلامەتی)لـە (کافر)آن (خراپ)ترن، شکستی (إسلام)نشسـتی (إسـلام)، (ذلـة)ی (مُسـڵمان)ە هەمووی لەڕووی (فاسق)آنی بەد (عَمل)و بەد (ڕەوش)، بۆ (حال)ی (دنیا)وایـە؛ بابۆ (خاطر)ی (سُنی)یان، لە (قیامەت)کی هە (أفسق)ە، پـێش (رسـول الله)وە (خلیل الله) (حُلی)یان لەبەر بکرێ. (واقعاً)ئەگەر دەرکەی (عفـو)و (غفـران)یـان بەو (درجـە)نەکردبایـەوە؛ (فسـق)وا (تَعمّـم)ی نـەدەکرد. (شـافعی) (إعتبـار)ی (عدالەت)ئەکا، لە (ولایەت)و (شهادەت)؛ ئەگـەر (أئِمـة)کـانی دی (موافقـە)یـان کردبا، ئەمڕۆش (ڕەونەق)ی (تقوی)ئەما؛ (خلاصـە)بـە هـەموو لایـەتێکمان دا؛ ئێمـە (جـزا)ئـەبینین، کەوتینـە (جحـیم)ی (ذلّـة)؛ ڕۆژی (جـزا)بـزانین، چـمان بەسـەردێ؟ هانامـان، (إلتجـا)مـان بـۆ لای خوایـە؛ (مقـام)و (تشـریق)گاهیـان ﴿جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا﴾ ئەچنە ناوی ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا﴾ لـە (جنّـات)ی (عـدن)دا ﴿مِنْ أَسَاوِرَ﴾ بـازن ﴿مِـن ذَهَـبٍ﴾ لـەزێڕی، وەکـی شـاهانی (إیـران)﴿وَلُؤْلُـؤًا﴾ (تاج)ی (مُکلّل)بە (لؤلؤ)؛ وەکی (إنپراطور)آنی (حاضر)ە، وەکی (نظام) (حیدر آباد)سەراپا، (جواهر)ە ﴿وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ﴾ ئاوریشمی ڕاستی، فـەنتاری نـا؛ (خلاصە) (فقـرا) (موسـلمان)آن لـە (کِسـوە)ی (أعظـم)ی (ملـوك)ی (مُحبـبّ)ی (زخارِف)ئەبن. (سبحان الله) (إنسان) (علی الأکثر) (حتّی)لە (آخرەت) (مَیـل)ی مندالّی دانانی؛ ئەگەر (میـل)ی منـدالّی نـەبێ، پادشـاهی (عظـیم الشـأن)؛ مـت مۆری چۆن بە خۆیەوە ئەکات؟ بە (أجار)و (مجـار) (مسـرور)و (مُبـاهی)ئـەبێ؟ (عبدالحمیـد خـان)ی (ثـانی) (ذات)ێ گـەورە بـوو؛ (لبـاس)ی سـورمەلی - (أصـلاً)لەبـەر نـەدەکرد؛ نیشـانەکی بـە (حجـم)گچـکە، نیشـانەی خانـەدانی (سلطنة)لە (أیام)ی (رَسمیة)ی بە سـینگیەوە ئەخسـت و بـەس؛ وە (معلـوم)ە زێڕو زیوو (زینة)و ئارایشی (جنّة)قیاس لەئی (دنیا)ناکێ؛ وەکـی ئەفـەرموون:"

(إشتراك)ی (لفطي)یە " ﴿وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ﴾ ئی (دنیا)یە، هەرچی هەیە؛ لە هەمووی ناخۆشتر (حُزن)ی (غلبە)ی (کافر)و (فاسق)آنە. (نقل)ئەکەن لە (شێخ محی الدینی عربی)، :" (حُزن)و (خوف)لە (مکر)ی (إلهی)؛ لە (حیث)ئەفەرمووێ: " (جماعەت)ی ئەبەن، بۆ بەهەشت؛ تائەگەنە نێزیك قاپی؛ چاویان بە باغ و داغ و (قصور)ی (جنّة)ئەکەوێ؛ ئەفەرمووێ: " بیان گێڕنەوە" ئەیان گێڕنەوە؛ بە (حسرەت)ێ نایەتە (تقریر)؛ بۆیە (شێخ)ئەفەرمووێ:" ئەوەی (ولی)و (أهل)ی (عرفان)بێ؛ تا نەچێتە ناو بەهەشت (أمین)نابێ؛ کە (داخل)ی (جنّە)بوو؛ ئەجا ئەفەرمووێ:" (الحمد لله .......الخ)". تەماشای فەرموودەی ئەو (شێخ)ە ئەو (ولی)یە (عظیم)ەی کەن؛ وە (إعتقاد)ی (مسلمان)آن لە (حق) (ولی)یە (عظیم)ەی کەن؛ وە (إعتقاد)ی (مسڵمان)آن لە (حق) (ولی)یان.

(لطیفةٌ): (سیّدی آلوسی)(قیل)ێ (نقل)ئەکا: " (مراد)لە (حُزن)، (حُزن)ی (کرێ)ی خانی یە" منیش لەوێم نووسی: بەو دیارە ئەو (قائِل)ە خانووی نەبوە، وە (عاجز)بوە لە کرێدانی، خانووی بە (کرێ)گیراو؛ وە(ظاهر)وایە ئەو (ذات)ە ـ (دار المقامە)بە (خانووی) بێ (کرێ)(تفسیر)کات ﴿إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ﴾ (بشر) (علی الأکثر) (خالی)نیە لە (قصور)؛ (إحتیاجی)بە (غُفران)ی خوای هەیە ﴿الَّذِي أَحَلَّنَا دَارَ الْمُقَامَةِ﴾ خانی خۆش، (دار)ی (إستقرار)؛ لێ ی ـ دورناکرێێن؛ بۆ (کرێ)ی خانوو، کەس هەڵمان ناپێچی؛ (واقعاً)کە (خیال)ی لێ ئەکەن، (أمین)نەبوون، لە (بَقی)و (قرار)گرتن، لە (دار)ی (دنیا)؛ (حُزن)و (کدَر)ێ (عظیم)ئەدا؛ لە (عَین)ی خۆشی و (لذّەت)، کە (إنتقال)ێ واناخۆش دێتە (خیالّ)، هەموو (عیش)و نۆش تێك ئەدا ﴿مِن فَضْلِهِ﴾ (حقّ)ی (مسڵمان)وایە، ئەوەی (إنعام)ی (إلهی)بێ، بە (فضل)و (کرم)ی بزانی. خوای (تعالی)ن ئەوان بە (صاحب)ی (حق) ئەزانێ؛ (مقابل)ی (إستحقاقا)و (زێدە)ە (کرم)ئەفەرمووێ:" ﴿لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ﴾(تعب)، ماندی یەتی. ئەمڕۆ بەو

گەرمایە، بەو (هوا) (مُكدَّری)یە، نەوجەوانیَ؛ (فقیر)، (محتاج)، ئەڕواتە (چناروك)، بەپای پیادە؛ ئەو هەورازەو نشێوی ئەبڕیَ، ئەچیَ لە ناو باغی پێمەڕە ئەكات، عارەقی ڕەش و شین ئەڕێژیَ، باز بە (كمال)ی (تعب)دێتەوە، بە (دِرهم)ەكی (یعنی)پەنجا فلس، ئەوجا ئەگەر (صاحب) (عائلە)بیَ، بەچی بدا؟ چۆن بە (درهم)یَ ڕای بوێریَ؟﴿ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ﴾سستی؛ (دائماً)لە (نشاط)ن؛ نەلەبەر ماندی بوون، نەلەبەر نەساغی، (وهن)یان ویَ ناكەویَ ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا﴾ لام وایە، (عرض)كراوە، لە (سورە)ی (مكی)باسی (فاسق)آن نیە؛ (حتّی)ئی (منافق)انیش، یا (مؤمن)ی چاك، یا (كافر)ی (صریح)؛ ئەوە دوایە (تَعشّب)ئەكا ﴿لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ﴾ ئەمێنن، تیایا﴿لَا يُقْضَى عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا﴾ مردن نیە، سەد خۆزی پیَ ئەبەن ﴿وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا﴾ (تحقیق)یَ (حسن)نەكریَ، (تحقیق)نیە. لام وایە لەگەڵ (قول)ی (شێخی عەرەبی)، ئەو (آیة)ە (توافق)ناكا؛ گۆی یا(أهل)ی (نار)، (لذّت) لە(عذاب)ئەزانن؛ (حتّی)ئەلیَ (یُسَمیّ عذاباً مِنْ عذوبةِ لفظه وَذاكَ لَهُ كالقشرِ، والقشرُ صائنٌ)﴿كَذَلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُورٍ﴾ (فعول)لە (صیغة)ی (مبالغه)یە، (مراد) (كفر)ی (جحد)و (شرك)ە، جیَ ی (كفران)ی (نعمة)نیە ﴿وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا﴾ هاوار ئەكەن، دەقیژێنن ﴿رَبَّنَا﴾ خوای ئێمە﴿أَخْرِجْنَا﴾دەرمانخە، لە (جهنّم)یَ﴿نَعْمَلْ صَالِحًا غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ﴾ (إیمان)یان هێنایە، پەكیان لەسەر (عمل)ی چاكە ئەكەن، (ألجواب)؛ نابیَ ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ﴾ئەوەندەمان نەژیاندن، (مُدّه)یە ئەوەند، (عقل)تان تیژبیَ، پەردەیی (هوا)و هەوەس بدڕێنیَ؛ (تذكّر)یَ (إعتبار)یَ (تأمل)ی لە (أحوال)ی ئایینەدەو ڕەواندان و (تفكر)یَ لە (عاقبەت)بكەن؟ (مُدّه)یە وا ژیان، ئەوەی (قابل)ی (تذكّر)و (تفكر)كردن بیَ، تیای (تذكّر)بكات، بەلام (غافل)بووی بن، هەڵیان خەڵەتاندی ین؛ وەبۆ (إزاله)ی بەهانە ﴿وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ﴾ وەكی فەرمووی ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾ (سبحان الله)ئەو (مُدّه) (تجدید)ئەكەن، بە (وُجوه)ی (مُختلفة)؛ یەكیَ

ئەڵێ:" شەست ساڵ" یەکێ ئەڵێ:" پەنجا" یەکێ ئەڵێ:" چل و شەش" یەکێ ئەڵێ:" چل" یەکێ ئەڵێ:" سَنُّ البلوغ" یەکێ ئەڵێ:" حەڤدە" یەکێ ئەڵێ:" هەژدە" یەکێ ئەڵێ:" بیست" یەکێ ئەڵێ:" لەبستی تا شەست" ئاگایان لێ نیە، (کافر)ەکان (أعمال)یان (مختلف)بوە؛ (وکذا) (نذیر)؛ یەکێ ئەڵێ:" پیری" یەکێ ئەڵێ:" (حُمّی)" یەکێ ئەڵێ:" (موت)ی خزمان" یەکێ ئەڵێ:" (کمال)ی (عقل)" نا(شکر)ی نەبێ، کووا (کمال)ی (عقل)؟ ئەگەر (کمال)ی (عقل)بووبا، ئەو (حال)ە، نەدەبوو ﴿فَذُوقُوا﴾ بچێژن﴿فَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾ (فاسق)یش وایە، (نصیر)ی نی یە، بێ کەسە، بەس (رەحمەت)ی خوای هەیە، خوای خۆی ئەزانێ چیان پێ دەکات ﴿إِنَّ اللَّهَ عَالِمُ غَيْبِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ ئەوەی بە (مشاعر)و (حواس) (دَرك)ناکرێ، نای گاتێ؛ (علم)ی (إلهی) (ذاتی)یە، یەکی لەسەر (آلآت)نەکەوتوە؛ (تعلّق)ی بەهەمووشتێ ئەبێ، (علی السَّواء)؛ هیچ شت (مانع)نیە لە (إنکشاف)ی؛ دیارە ئەو (علم)ە، کە (مُقتضی)ی (ذات)ە، بۆ (غیر)ی (ذات)ی (کبریائی) نابێ؛ وە (إلّا) (مُقتضی)ی (ذات)نیە؛ ئیتر تێ بگە، بزانە (علم)بە (قیمەت)ە؛ بە (هوا )ی (جاهلان)ە بۆ (خاطر)ی (فلان)و (فلان)، (علم) (هَدَر)مەکە؛ مەب (ملا)ی (جاهل)پەرست ﴿إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ ئەزانی، ئەوانە، ئەگە (إرجاع)بکرێن، بۆ (دنیا )، (عمل)ی (صالح)ناکەن؛ با ئەچنەوە، سەر (حال)ی پێشی؛ زۆرمان دیتیە، لە (وەقت)ی لێ قەومان شتێ بوە(بعدە) هەر هەوە، گەزێ چی بانگی چی پیاوێ ترە؛ ئەڵێ ی نەبای پێدا هاتیە، نەباران! بۆ (ربط)ی (آیة)، (إمام)و (غیر)ی (إمام)دووان؛ (أمّا)لام وایە، (توجیە)یان بێ (وَجە)ە﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَائِفَ فِي الْأَرْضِ﴾ لەدوای (أُمم)ی (بائد)، ئێوەن جا نیشینیان؛ ﴿فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ﴾ (وَبال)ی بەملی خۆی وەکی ئەوانی (سابق)﴿وَلَا يَزِيدُ الْكَافِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا﴾ زۆر سووکی، (بُغض)و (غضب)﴿وَلَا يَزِيدُ الْكَافِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا﴾ (شرف)و (مجد)ی (إنسانی)نابێ، لە (فضائل)ی (نفسیە)

(محروم)ئەبێ. ئەمڕۆ لە (أعظم)ى (بُقاع)ى (أرض)، (مَزايا)ى (دين)و (كرامەت)و (شرف)ى (إنسانى)نەماوە؛ ئەوەندە بێ (حِسّ)بووين، ئەو (خسارە) (دَرك)ناكەن، (مَتألّم)نابن؛ (ذاتاً) (إيمان)يان بە (يوم)ى (جزا)نيە؛ (لاشك)زيان و (خسارەت)ى (عظيم)يان، ئەوێ ڕۆژێ بە ﴿قُلْ﴾ (أيُّها الدّاعى)﴿أرَأيْتُمْ﴾بەچاوى لەپك لێ كەتێ، ئەگەر تەماشايان كردبێ، ئەيانزانى چن؟ ﴿شُرَكَاءكُمُ﴾ بە (زعم)و (وهم)و (خيال)ى (فاسد)و (ميل)ى (أحمقان)ە ﴿الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ كابرايە بانگى (شخص)ەكى ئەكرد، لە (هەرتەل)ێ: " هۆ هۆ (حمد)ى (حمد)آن" (جواب): " ما باكەى؟"؛ " بنۆڕە بەردە بۆرا پشت مالان، بزانە كووچە كەرا، من نيە؟" (حمد)ى (حمد)آن:" ئێە، بەلەپكى لە چاوان كەتى، گەر ئەڵێى بەردا بۆرە پشت مالان؛ ما ئەڵێ ى: بزانە كووچە كەرا من نيە؟" (حقيقةً) (عقل)لە (أحوال)ى ئەوانە(مُتحَيّر)ە؛ ئەوانى پێشى هەرنە (ئيسە)؛ ئەمڕۆ (علم)و (ذكاء)والە (ترقّى) ( بشر)يش - (كما فى الزمن الغابر) (غريق)ى (شرك)و بت پەرستيە ﴿أرُونِي﴾ نيشانم دەن ﴿مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الْأَرْضِ﴾ لە (نفس)ى ستارەيى زەمين؛ يائى لەسەر عەردى، نەخۆيان ديارن، نە (ديارن)، نە(أثر)يان؛ نەك (مُمثّل)ەكان بێ (أثر)و (خَبر)ن؛ (قوم)ێ ئەڵێن: "ئەوەى نەى بينين، -(يعنى)نەتە بەر (حِسّ) (إيمان)ى پێ نايەنين" بەڵكوو (حُكم)بە نەبوونى، ئەكەين" ديارە (ربّ) (إله)بێ (أثر)نابێ؛ (سبحان الله)بت پەرستان و (أشباه)يان لە ئێمە، (هيكل)و پەيكەر ئەبينن، (أمّا)بە (نوع)ى تر، ئەى نۆڕنێ؛ (ظاهر)شتێكە، (باطناً)شتێ ترە؛ ديارە لە (أرض)ى بێ (أثر)ن؛ (حتّى) (مَلَك)لە (عالم)ى (طبيعة)؛ (أصلاً) (أثر)ى نيە؛ (إيمان)بەوان، (تابع)ى (إيمان)بە (رسول)ە ﴿أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي السَّمَاوَاتِ﴾ لەعەردى نەبێ، ئاسمانان هەيە؟ (حاشا)؛ بە (نظر)و (فكر) (معلوم)نيە، ماوە (سمع)؛ ئەويش نيە ﴿أَمْ آتَيْنَاهُمْ كِتَابًا﴾ (رسول)مان ناردبێ، بە (وحى)ى (إلهى) (تبليغ)ى كردبن، كەخوا (شريك)ى هەيە ﴿فَهُمْ عَلَى بَيِّنَةٍ مِّنْهُ﴾ (حُجّەت)

(یعنی)به (دلیل)ی (قطعي)بێ (تأویل) (ناطق)یی به (إتخاذ)ی (شریك)﴿بَلْ﴾ نه(عقل)ه نه (نقل)ه، (إتباع)ی (هوا)یه ﴿إِن يَعِدُ الظَّالِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا﴾(رئیس)و (مرؤس)یەکتر ئەخەڵەتێن. لە ( بعض)ی (آثار) (منقول)ه، وادەر ئەکەوێ، کە (إنسان)لەناو (رحم)ی دایکیان (تکوین)ی لە (طرف) (ملائکه)یە، ئەوەندەیە، ئەلێن:" خوا (ملائکەت)ئەنێرێ " نازانم لەگەڵ (قرآن)کوو رێك ئەکەوێ؟! (أنواع)ی (أشیا)ی (مُتبعَد)بەڵکی (مُحال)، (نسبەت)ئەدەن، بۆ (ملَك)و (جِن)؛ (سلب)ی (إختیار)لە (إنسان)ی (مُکلّف)ئەکەن؛ ئەمە چیە؟ چ (معنا)یەکی لێ ئەدەنەوە؟ ﴿إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَن تَزُولَا﴾ به (قدرەت)ی (إلهی) (بقا)یان ئەبێ؛ بەڕاگرتنی خوا، (منع)ئەبن لە (زوال)؛ (عالم) (ممکن الوجود)ه، (عِلّة)ی (حاجەت)بۆ (عِلّة) (إمکان)ه؛ (ممکن) (دائماً) (حتّی)له (عدم)یشدا (إحتیاج)ی به (ذات)ی (ممکن)یەکسانە؛ له (وجود)و له (عدم) (محتاج)ی (عِلّة)ه؛ (وکذا)لە (حال)ی (بَقا)چ له (دار)ی (فنا)، چ لە (دار)ی (بقا)، (فرق)ناکا؛ (وجود)ی (کائنات) (عُلوی)و (سفلی)؛ وه (بقا)یان به (علم)و (قدرەت)ی خوایە؛ (یعنی) (علم)ی (صانعی)؛ وەهەم ئەو (مُرکبا)ه، له (نوات)لە (ذرات)لە (غُدد) (مرکّب)ه ئەو (ذّرات)و (أجزا)یە، به (أُلف)ی (کیماوی)بە (قوەّت)ی (تجاذب)یەك ئەگرن؛ (هیئەت)ی ئەو (مُرکبّ)ه به (قوەّت)ه، (حفظ)ی ئەو (ترتیب)ه (عجیب)ه، کە (عُلما) (کشف)یان کردیە، (بداهەت)ی (عقل) (شاهِد)ه ئیشی (ذات)ێ؛ (علیم)و( قدیر)و (قاهر)ی (طبیعة)ه وەهەم، (أجرام)بەو (نظم)و (ترتیب)ه، (شمس)له (وسط)؛ (سیارەّ)لە (دَور)ی؛ (شمس)و (قمر)لە(دور)ی (سیارە)؛ ئەو (ثبوتة) (قرار)ه، به (قوەّت)ی (تجاذب)و (تدافع)و (تماسك)، ڕائەوەستێ؛ ئەویش (قوەّ)یە خوای یه ڕاگیری ئەکا؛ هەر (معنا)یە لە (مَسَك)ئە دەنەوە (لاشك)ئی خوایە؛ (أثر)ی (علم)و (قدرەت)ی (غالب)ی وی یە؛ کە ئەو (أجرام)ه (هائله)بەو (قُوا)یە، بەو (نوع)ه له ژێر(ناموس)ی (طبیعة)ڕای گرتیە؛

(وعلی کل حال) (حرکە)ی (کُرات) (منافی)ئەو (مَسك)ە نیە؛ گەرچی (بعض)یْ (أوائل)و پێشەوا، وایان زانیوە، ڕۆژ ئەکەوی، (مسك)بە ڕاگرتنی بۆ (حرکە) (تفسیر)ئەکا؛ (معلوم)ە (أوائل)زۆر ئاگایان لە (علم)ی (هیئەت)نەبوە؛ وە (مُتأخرین)ی (غرب)گەلیْ (أحکام)یان، نەگۆڕی؛ (أغلاط)ی (حسّ)ی (أسلاف)یان دەرخست﴿وَلَئِن زَالَتَا﴾ هاتنە سەر زوال (قوەت)ی (تماسك)و (تدافع)و (تجاذب)یان (ضعیف)بوو هاتنە لێك بوونەوەو (مُصادمە)﴿إِنْ أَمْسَكَهُمَا﴾ (یعنی): (ما)؛ نایان گێڕێتەوە، ڕێکیان ناخاتەوە ﴿مِنْ أَحَدٍ مِّن بَعْدِهِ﴾ (بعد إمساکە، تعالی)یا (بعد الزّوال و الإضمحلال)؛ خوایە وا، ئێوە (إنکار)ی ئەکەن، یا(شریك)ی بۆ پەیا ئەکەن؛ ناشزانن (نظم)و (ترتیب)و (ترکیب)و (تألیف)و (وضع)ی (عالَم)چیە؟ چۆن؟ چی گەرەکە؟ لەبەر ئەوە نەبا ﴿إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾ ئەبا، بێ (إمهال)بە (أشدّ)ی (عذاب)گرفتارتان کا؛ (خلاصە)لە (خلق)و (إدامە)و (إدارە)ی (کائنات)، (غیر)ی خوا، کەس (مُداخلە)ی نیە، (غیر)ە (ممکن)ە؛ وە (أجلی) (بدیهی)یە ، ئەو (نظم)ە، ئەو (صنع)ە (مُتقن)و (مُحکم)ە، (مِن تلقاءِ نفسە)نابیْ﴿وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ﴾ سوێندیْ (صحیح)ی، سوێندی (بلیغ)ی ئەخۆن بەخوای ﴿لَئِن جَاءَهُمْ نَذِيرٌ﴾ (رسول)یْ (مُنذِر)ئەوانیش زانیویانە، (إحتیاج)یان (أوْلا)بە (مُنذِر)ە ﴿لَيَكُونُنَّ﴾ بە (تأکید)﴿ أَهْدَى مِنْ إِحْدَى الْأُمَمِ﴾ لە (أمّة)یْ (أوحد)ی (مُمتاز)لە (أُمَمْ)یالە میانی(أُمَمْ)، یەکی (أهدی)ئەبن، لە هەموان ﴿فَلَمَّا جَاءَهُمْ نَذِيرٌ﴾ (سیّد الأمم)﴿مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا﴾ دووری لە (حق)؛ دەها دوورکەوتنەوە.

ئەوی (مسلّمان)بوو، لە عەرەبان (مسلّمان)بوو، ئەوی (مسلّمان)نەبوو، (کفریّات)یان (زیاد)کرد، (دەعوا)ی (رسالەت)یان زیاد کرد (حتی) بۆ (ألوهیەت) چوون (جبّاریان)زۆر بوون، وە (حرمەت)ی (کعبە)یان لانەما﴿اسْتِكْبَارًا فِي الْأَرْضِ﴾لەبەر (إستکبار)خۆ گەورە (حساب)کردنی بیْ (وجە)، لە چاو (أُمم)آن بەهیچ نەدەچوون﴿وَمَكْرَ السَّيِّئِ﴾ فێلْ، خراپی

(زیاد)کردن، چ بەو (نوع)ە (مکر)یان ئەکرد، بۆ فەوتانی (رسول الله)بۆ (منع)ی (ناس)لە (إیمان)بۆ (منع)ی (نشر)ی (إسلام)، چ (هذیان)یان دەر(حق) (رسالەت پەناه) (نشر)ئەکرد؟! ﴿وَلَا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِ﴾ (إحاطة)نادا، (إلا)بە (مکر)کەرەکان(إلهی) (مکر)ی (سیئ)دەر(حق)بە (عباد)ت، ئەمرۆ خۆت ئەزانی، لە چ (درجە)یە دایە؛ خوایە (عن قریب)بینوێنێ وایان دووچار کەی، (مکر)یان لەبیر نەمێنێ؛ (رَحم)ێ بە دڵپاکان کەی، ﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ﴾ (الله)﴿الْأَوَّلِينَ﴾ (مکّار)ەکانی رابردوو ﴿فَلَن تَجِدَ﴾ نابێ ﴿لِسُنَّتِ اللَّهِ تَبْدِيلًا﴾ بگۆڕێ؛ (قاعدە)ی خوای (مُطرِد)ە، (مادام)ئەو هەموو (أُمم)ی (کافرە) (إبادە)ن، وە (مکر)ی (سَيِّئ)یان بە خۆیان گەیاندەوە، ئەو (قَوم)ەش وایان بەسەردێ، (محفوظ)نابن ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلًا﴾ لە (طرف)ێ بۆ (طرف)ێ تر بچێ؛ (سیّد)ی نێزیکە لەدەست (مکّار)آن ـ لە (أجنبی)و (غیر)ە (أجنبی) (دین)ی (إسلام)، (علم)ی (دین) (محو)بێتەوە؛ (ملا)ی دەوڵەمەندی، بە (قوەت)و (غیرەت)و (عقل)و (حُبّ)ی (إسلام)ی پێ ئەوێ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا﴾ (قوم)ی (قریش)﴿فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا﴾ لە (آثار)ی (حرِبە)یان ﴿كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ﴾ لە (أثار)دەرئەکەوێ﴿وَكَانُوا﴾ ئەوانی پێشی ئەوان ﴿أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً﴾ (قیاسی)لەنێوان ناکرێ؛ نەبە (عدد)نەبە (عُدَد)، ئەمان ناگەنە وان﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعْجِزَهُ مِن شَيْءٍ﴾ هیچ شت ﴿فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ﴾ لە ئاسمانان و (أرض)یدا، ئەوی (عاجز)ناکا؛ هەمووی (مَقهور)ی خوایە﴿إِنَّهُ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا﴾ (علم)ی بە هەموو شتێ هەیە، ئەوەی (إرادە)بکا، پێ ی ئەکرێ ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا﴾لە (سیّئات)و (مکر)و (فساد)و (تجبّر)و (تکبّر)و (ظلم)و (تجاوز)لە (حقوق)ی یەك ﴿مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا﴾لەسەر ڕوویی عەردی ﴿مِن دَابَّةٍ﴾ ئەوی لەسەر عەردی بڕوا، کەسی هیچی نەدەهەیشت؛ کە (غضب)ی هاتە جۆش، تەڕ و وشکی، وێکڕا ئە سووتێنێ﴿وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ﴾ ئەو (سواد)ی (أعظم)ە لە گوناهکاران و

بەد ڕەوشتان﴿إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ بۆ (إبادە)ی (أُمم)یا ڕۆژی وا پەسین﴿فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ﴾ (أمّا)هەموو(أمّە)ی (خراپ)وێکرا (أجل)یان نایە؛ (أجل)ی وایش وەکی (آخر)آن ـ بە کورت و درێژی و دەرنگ و زوویی ـ (فرق)ی هەیە﴿فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِ﴾ (بَرّ)و (فاجر)؛ (مؤمن)و (کافر)، (مصلح)و (مفسد)، ساغلەمو (مکّار)﴿بَصِيرًا﴾ هەریەك بە گوێرەی (إعتقاد)و (إعمال)ی (جزا)ئەدرێ (إلهی أنتَ بصيرٌ بعبادك)لەهەزاری یەك، ڕووی لە توو نیە؛ (رَعایا)وەکی (حیوانات)، بۆ (رؤسای)ی (جُهلا)و (مکّار)ەکان (مُسَخّر)ن؛ (دین)ی (مُبین) (العیاذ بالله)لە (إنقراض)دایە؛ (حِسّ)ی ناکەن، پێ ی (متألم)نابن نانۆڕنە (علاج)ی، بۆ (إدارە)ی (علم)ی توو، (درهم)ی (صرف)ناکەن، بۆ (هوا)ی (نفس)بە (قنطار) (مال) (إضاعة)ئەکەن؛ ئیتر ماوە

(إعانە)ی تۆ؛ خودایە (حفظ)ی خانەدانی (عملی)کەی؛ (إعانە)ی بدەی (آمین).[1]

## (سورە)یی (یس)

(سورە)یی (یس) (مکّی)یە، لە (قرآن)ی کەلەسەر (لوحەی) (تفسیر)ی (زمخشری)نووسراوە، ئەڵێ:" (إلاّ) (آیە)ی چلو پێجەمین، (عدد)ی (آیات)ی (٨٣)یّ یە؛ لەپاش (سورە)یی (جِن) (نازل)بوە" (أمّا)من چ (مناسبە)ی نابینم؛ (حتّی) (حسب الوقائع)چی وا ناڵێن، دوای (وَقعة)ی (جِن)بووبێ؛ وە بووبێتە، (سبب)ی (نزول)ی ئەم (سورەت)ە. (بعض)یّ (آثار) (نقل)ئەکەن، (دائر)بە (فضل)ی (سورە)، وەپێ یان (توجیە)ناکرێ. کەسێ بە (حق) (قرآن)تەماشا کا، بە (قدر) (حال)تێ بگا، ئەزانێ، هەمووی (مُنْتَخب)ە،

[1] – تەواو بوو (تفسیر)ی (سورە)ی (ملائکە)= (سورە) (فاطر)لە (فاطر السموات والأرض) (طلب)ئەکەم (موفق)مان کا ڕۆژی دووشەموو؛ بە (حساب)ی (تقویم)ی (إیران)٢٥/ مانگی مولود (٢)مایسی ڕۆمی (سنە)ی ١٣١٨شرقی ١٩٣٩ میلادی.

(لُبّ)ە، (روح)ى (هدايەت)ە ئەڵێن: " (يس) (قلب القرآن)ە" (قرآن)هەمووى: (قَلب)ە، (فؤاد)ە، (خلاصه)يە؛ (نور)ە؛ ئەوى (إقتباس)ى لەگەڵ (سورەت)ى (سابق)زۆر (ظاهر)ە؛ ئێستا بۆت (معلوم)ئەبێ.

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿يس﴾ (خصوص)لێره (بعض)ە قسەيان كرديە، (لكن)هيچى بە (دڵەوە نانووسێ؛ (ماشاء الله) (بعض)ى (نوات)لە (لغات)ى (مختلفه)زۆر ئاگادارن، (أمّا)ئاگايان لە لغەتى (إنگلين)نەبوە؛ وە (إلاّ) (ممكن)بوو، بڵێن:" (إشارە)يە بۆ (يەس)" (إنگلين)آن لە (خطاب)يان، زۆر (إستعمال)ى ئەكەن؛ گوێ ڕاگرە، ئەى (سليم الطبّع)، (سيّد الأنام)، (سِرّ)ى (مكتون)؛ سوێندت بۆ ئەخۆم ﴿وَالْقُرآنِ الْحَكِيمِ﴾ (ذى حكمەت)، (ناطق)ى (بالحكمه)، (مُتّصف)بە (حكمەت)؛ (مُكمِّل)ى (نفوس)، (حاكم)ى(قرآن)ى (حكيم) (مِنْ لَدُن عَليمٍ حكيمٍ)، (شاهِد)ە، لەسەر (رسالەت)ى (خاتم الرسل)﴿إِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ ئەوانەى (صاحب) (درجات)ى (عاليه)، (مُتفاوتەت)وەكى لە (سورە)ى (بقرە)فەرمووى: ﴿عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ ئەمەش (شاهد)ێ (فطرى)ڕێ ى ڕاست، بێ (ميل)و (محابا)، بێ (فرق)و جودايى)، لە (بين)ى خۆيش و بێ گانە؛ (أمّا) (شيعه)لێ نەگەڕان كرديانە (ئەفسانە)ى (إيرانى)، (تأسيس)ى (ملكى) (خوسرەوانى)، دوور لە (أساس)ى (مسلّمانى)﴿تَنزِيلَ الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ﴾ ئەو (قرآن)ە (حكيم)ە، لە (طرف)ئەو (غالب)ە، بە (مرحمەت)ە، ناردرايتە سەر توو ﴿لِتُنذِرَ قَوْمًا﴾ (قوم)ێ كە خۆيان ئەيان خواست (إدعّا)ئەكرد، ئەگەر (نذير)مان بۆ بێ، ئێمە (إتباع)ى ئەكەين، لە (هدايەت)و (سلوك)ى (صواب)، ئەبێتە سەر (تاج)ى (أُمم)؛ (قوم)ێ كە ﴿مَّا أُنذِرَ آبَاؤُهُمْ﴾ لە (زمان)ێ دوور، ئەگەر بووش بووبێ، لە (فكن)آن دا نەماوە، وەكى (رسول)ى (أُمم)ەكانى بە (هلاك)چوويى (دين)و ئاينيان، نە (إسم)ى ما، نە (ڕەسم)ى ﴿فَهُمْ غَافِلُونَ﴾ (مادام) (عصبيەت)ى (دين)يان نەبوە، بێ ئاگاو (خَبر)ن؛ (كأنّهُ) (خالى

الـذهن)ن، لـه (ترديـد)و (إنكـار) (إيجـاب)ی ئـەكرد، بـه (عُمـوم)ی بەئاسـانی، (إيمـان)بێـنن؛ وه (ممكـن)ه بڵـێن:" بـۆ (شـعور)و (جـاهلی)، بـوه (مـانع)ی (أكثر)يان له (إيمان)؛ وه (مانع)ی تريش هەيه" ﴿لَقَدْ حَقَّ الْقَوْلُ عَلَى أَكْثَرِهِمْ﴾ لـه (صـدر)ی (كتـاب)فـەرمووی: ﴿وَسَـوَاء عَلَـيْهِمْ أَأَنـذَرْتَهُمْ أَمْ لَـمْ تُنـذِرْهُمْ لاَ يُؤْمِنُـونَ﴾ وەلـه چـەند جـێ يـه تـريش (تصـريح)ی پـێ كـرد؛ ئەوەنـدەی لـه (وسع)ی بوو، كردی، نەيان بيست؛ وەكی له (سوەرت)ی (سابق)فەرمووی﴿مَّا زَادَهُـمْ إِلَّـا نُفُـورًا* اسْـتِكْبَارًا فِـي الْـأَرْضِ وَمَكْـرَ السَّـيِّئِ﴾ ﴿فَهُـمْ لَـا يُؤْمِنُـونَ﴾ (قابل)نيه، (إيمـان)نايـەنن؛ (حسـد)و (تجبّـر)و (تعظـم) (مـانع)يانـه؛ زۆرجـار و توومانه، وەكردوومانه به (قاعده) (عِلم)له (معلوم)ی؛ له (علـم)ی، (أوصـاف)و (لـوازم)وەرنـاگرێ؛ (وظيفـة)ی (علـم) (كشـف)ه، ئێمـه (إيمـان)مـان هەيـه، بـه خوداوەنـدێ (واجـب الوجـود)و (قـديم)؛ (مـع أنّـهُ) (علـم)ی ئێمـه (ممكـن)ه، (حـادث)ه، وانيـه (ايمـان) نەيـەنانيان لەبـەر ئـەوەبێ، خـوا زانيويـەتی (إيمـان)نايـەنن؛ بـەڵێ وايـه، (إطـلاع)ی ئـەو، لەسـەر (أسـرار)و (أحـوالات)ی (نفسـيه)ی (أشـياء)، لـه (غايـەت)ی (كمـال)ه، بـێ (نقـص)ه؛ ئـەوەی ئـەو ئـەيزانی، خـەڵكی ڕێ ی پـێ نابـا؛ (أمّـا)ئێمـه دەڵـێن: " بـا (إيمـان)بێـنن، (ممكـن)ه، ئـەو ئـەزانێ لـه (دائـره)ی (إمكـان)ی (إسـتعداد)دەرچـوون، وه (مُجرّد)ی (إمكان)ی (ذاتی)بۆ بونی شت، (كفايەت)ناكا؛ (خلاصه (إيمان)ی وان (ممكن)ی (ذاتی)يه، (مُمتنع)ی (بالغير)تا ئـەو (غـير)ه (زوال) نـەبێ (إيمانيـان) (بالفعل) (ممكن)نيه، نابێ" ﴿إِنَّا جَعَلْنَـا فِـي أَعْنَـاقِهِمْ﴾ له مليـان، ئەستوويان ﴿أَغْـلاَلاً﴾ زنجـير و زولان، لـه ملمـان پێچـاين، بـەلای سـەری ﴿فَهِـيَ﴾ ئـەو (أغلال)ه، (أمّا) (رجوع)ی بۆ دەسـت (فهـم)نـاكرێ ﴿إِلَـى الأَذْقَـانِ﴾ چـەنەگه، ﴿فَهُم مُّقْمَحُـونَ﴾ مليـان ناچـەمێتەوه، لـووت و قـەپۆزيان بـۆ هـوا بڵنـد ئـەبێ، بەرپێی خۆيان نابينن. تەماشايان كەله (قُمح)چەند قسەيان هەيه؛ ئەو (غَـلّ)ه (غَلّ)ی (تقليد)و (كبر)و (حسد)ه، (منـع)ی كردينـه، لـه (تسـليم)و (إنقيـاد)بـۆ

(رسول) ﴿وَجَعَلْنَا مِن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ﴾ لە پێشەوەیان ﴿سَدًّا﴾ (سدّ)ێ گەورە، (كثيف)، (مانع)ی (ماوراء)لەدیتن ﴿وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا﴾ لە پشتەوەیان ﴿فَأَغْشَيْنَاهُمْ﴾ بەو (سدّ)انە چاومان پۆشنە ﴿فَهُمْ لاَ يُبْصِرُونَ﴾ پێش و پەشتی خۆیان نابینن؛ نە (تأمل)لە (أحوال)ی ڕابردوان ئەكەن، نە(تفكر)لە (آتی)، ئەو (سَدّ)ە (جهل)و (إستكراه)ی زانین و (إشتغال)بە (لهو)و (لعب)ی (حال)ی (حاضر)یانە (إستعالات)و (تشبيهات)ێ كەلە و (آية)ەدایە، (خصوص)لەگەلّ (إختلاف)ی (نُظّار)آن، بە كوردی (أدا)كردنی (زەحمەت)ە، وەكەم كەسیش تێ ی ئەگا؛ (حِس)پەرست شت نەكا، بە (محسوس) (فهم)ی ناكا. چەند (روايات)ێ گۆی یا(سبب)ی (نزول)ن، زۆر (مُلايمە)یان لەگەلّ (عبارەت)نیە؛ (بالفعل) (واقعه)كە یا بووبێ، (أمّا) (سببيّەتی)لام خۆی نیە ﴿وَسَوَاء عَلَيْهِمْ﴾ لایان یەكە، (فرق)ی نیە ﴿أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ﴾ (تأثير)ی نیە، لەوان، شتێ بێ (أثر)وەكی نەبوە﴿لاَ يُؤْمِنُونَ﴾ (نسبەت)دانی، (مثل)ی ئەو (جَعل)ە، بۆ (حضرەت)ی (كبريائی) (جسارەت)ئەدا بە (سُنّی)یان، یا بڵێم: " (أشاعره)آن" كە (خلق)ی (كفر)و (ضلال) (بِلا سبب) (رأساً)بدەنە خودا؛ ئەفەرموون: خوا هەر وەك (هادی)یە، (مُضلّ)یشە" (مُعتزلي) (أصحاب العدل)ئەمە (قبول)ناكەن؛ من ئەڵێم:" (جناب)ی (حق)ی (أولاً) (هادی)یە؛ چ بە (خلق)ی (آيات)، چ بە (إرسال)ی (رسوُل)و (إنزال)ی (كُتب)؛ (هدايە)ی بۆ (عموم) (علی السّواء)ە؛ (بشر)هەرچەندە بێ (فكر)و (تأمّل)بێ، ئەوەندە ئەزانی (إنسان)لە گاجووت زێترە؛ دوای ئەو هەموو (أسباب)ی (هدايەت)ە، كەسێ بە (إتباع)ی (هوای) (عناد)بكا، (مُصِر)بێ، لەسەر (جهل)و (وقاحەت)، خوای (تعالی)ن، بە گوێرەی ئەو (حال)و (كيفيّەت)ی (نفسی)، (إمداد)ی ئەكا چاوی ئەگری، (غلّ)و زنجیری ئەكا، مۆری لەسەر دلّ دادەنێ، لە (دائره)ی (إمكان)ی (إستعداد)ی دەری ئەكا؛ بەو بو (منهاج)ە (نزاع)نامێنێ.

ینۆڕە کەسێ (شعر )دادەنێ، (أوّل)ی زۆر پێوەی ماندی ئەبێ کە (قوەّت)ی (ساند)، (عادە)وەکی قسە، (شعر)ی بۆ دێ (دقّەت)کەن، لە (أحوالات)ی (نفسی)، ئەوجا لە (آیات)ی (قرآن)ی قسە بکەن، چاکی تێ ئەگەن؛ کە (کفر)وا (رسوخ)ی بەست، لە (إنذار)ئەچێت دەر؛ (وقت)ی (جزا)یە (إنذار)بۆ وانە، بێ (فائدە)یە، بەڵکو (زێدە) (طغیان)ئەکەن ﴿إِنَّمَا تُنذِرُ﴾ (إنذار)ێ بە (فائدە)﴿ مَنِ اتَّبَعَ الذِّكْرَ﴾ دوای (نصیحەت)کەوێ، لە گوێ ی گری، حەزی لە زانین بێ، بە (کِبر)و (حسد)و (أنانیەت)نەبێ﴿وَخَشِيَ الرَّحْمَنَ﴾ کە (عبرەت)بە (أحوال)ی (أمم)بگری، جێ ی ئومید، لێ ی بترسی (مع الرجاء)﴿ بِالْغَيْبِ﴾ (حس)پەرست نەبێ، (إیمان)ی بە (أمور)ی (غیبیە) (عقلیّە)و (غیر)ە (عقلیّە)هەبێ؛ بزانێ چاکە بە خۆرایی ناڕوا، لە خراپە ئەتۆزێتەوە؛ دوور ئەندێش بێ﴿فَبَشِّرْهُ﴾ ئەو (تبشیر)ی (بعد الإنذار)ە، چەند جوانە ﴿بِمَغْفِرَةٍ﴾ (عظیمةٍ)﴿وَأَجْرٍ كَرِيمٍ﴾ (تفسیر)بە (جنّة)، (تفسیر)ە بە (ماصدق)﴿إِنَّا نَحْنُ﴾ بە جێ یە، (مقام)ی (عظیمة)و (کبریا)یە ﴿نُحْيِي الْمَوْتَى﴾ (ظاهراً) (موت)و (حیات)ی (طبیعی)یە؛ (أمّا) (حیات)ی (علم)و (إیمان)ی؛ لام وایە، جێ ی نیە﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا﴾ لە (أعمال)ی(خصوصیە) چ (خیر) چ (شر) ﴿وَآثَارَهُمْ﴾ (أمور)ی بە (ثمرة)؛ (نشر)ی (علم)، (تصنیف)ی باش، (صدقە)ی (جاریە)، (سُنّە)ی (حسنە)؛ (وکذا بالمقابلە) (نشر)ی (جهل)، (کتاب)ی (مُضل)، (سُنە)ی (سَیِّئة)ی (جاریە)، ئەوە خۆیەتی، کە (معنا)ی (زمخشری)و (مُحقّق)ەکانە هەندی (روایەت)هەن، گەرچی ڕاستن، (أمّا)نابن، بە (سبب)ی (نزول)؛ (آیة)بێ (ربط)ئەکا؛ باسی چوونە (جُمعە)و شەقاو هاویشتن بۆ مزگەوت نیە؛ ئەگەر (سبب)ی (نزول)یش بن، ئەبێ (حسب المقام) (آیة)ەکان لەو (نوع)ە (أسباب)ە، (صرف)کرێن؛ وە (إلاّ)ڕێك ناکەوێ لام وایە (أکثر)ی بێ ( رعایە)ی (نظم)ی (آیات)ە (کتابِ)ی (مُعجز)لەبەر (روایات)ە، یا لەبۆ (روایات)ە؟ (رجا)م وایە، ئێوە تا (ممکن)بێ، تەماشای (نظم)ی (عبارەت)ی (قرآن)کەن؛ وە

(معنا)ی بـه (جـوهر)و (روح) (إختيـار)کـەن ﴿وَكُـلَّ شَـيْءٍ﴾ هەرچـی بـێ؛ (أزلاً وأبداً)يا (أعمال)ی (مُكلّف)آن ﴿أَحْصَيْنَاهُ﴾ (إحصاء) (أصلاً)به (عنـا)ژمـارده، (مُراد) (ضَبط)و (حِفظ)ه﴿فِي إِمَامٍ مُبِينٍ﴾ (إمام)به (أصل) (تفسـر)ئەکەنـەوە؛ (مُبين)به (مُظهر)؛ ئەو (إمام)ە (مُبين)ە چيه؟ بەڕاستی (معلوم)نيـه؛ ئەوەنـده (معلـوم)ە (إمـام)ی (علـی)نيـه؛ (لـوح المحفـوظ)يـش بـه گـوێرەی (روايـات)ی (مولود)نامان ـ کەلـه (يـاقوت)ی (حمـرا)يـه، لـه زوبەرجـەدی گيرايـه؛ (سـيّدی آلوسی) (جزم)بـه (صـحەت)ی نايـنـێ؛ (لاشـك)بـێ (أصـل)ە؛ (خصـوص)شـەو ڕۆژی سێصەدو شەست جار (منظور)ی (نظر)ی خودايه، بێ (معنـا)يـه؛ ئەگـەر خوا (إعـاده)ی (نظـر)ی نـەکاتێ، ئـەبێ شـتی لـه (فکـر)بچـێ؟ (وإلا)بـۆ؟ (مَـعَ أنَّهُ)﴿وَمَا يَعْـزُبُ عَـن رَّبِّـكَ مِـن مِّثْقَـالِ ذَرَّةٍ فِـي الأَرْضِ وَلاَ فِـي السَّـمَاءِ﴾ وەهـەم (تكرّر)ی (نظـر)ی کـوو ئـەبێ؟ (فـالرَّأيُ: إلا مسـاك عَـنْ تشخيصـه وَ تَعْيِينـه)وه (حُكمـاء)ئـەڵێن:" (صُـور)ی (كائنـات)لـه (عقـل)ی (مجـرّد)دايـه؛ (عقـل)ی (مجـرّد)خـۆ و (معلومـات)ی لای (مبـدأ)ی (أوّل)* (حاضـر)ە" (ذاتـاً) (علـم)ی (باری) (حضوری)يه، کەوابی (تفسير)ی به (قرآن)، گەرچی (إمام)ە (مُـبين)ە، (حاوی)ی، لەسەر (علوم)ی (عديده)وه (أمور)ی (لايُعَدُّ ولايُحصـی) (لكِـن)لێره بـه (مناسب)ی نازانم ﴿وَاضْرِبْ لَهُم﴾ لە ڕووی (إنذار)و (إعتبـار)﴿مَّـثَلاً أَصْحَابَ الْقَرْيَـةِ﴾ ئـەڵێن:" (أنطاكيـة)يـه " نـازانم ﴿إِذْ جَاءهَـا الْمُرْسَـلُونَ﴾ (ظـاهر)ە، (صـريح)ە (رُسـل)ی خـوا بـوويـن، (رأسـاً)لـه(طـرف)ی (كبريـائی)نـاردراين؛ بـۆ (أهل)ی ئەودێ يە؛ (دەعوەت)ی (إلى الله)يان بکەن؛ (أمّا) (عيسـی)نـه(إسـم)ی هەيه، لێره نه (رسم)؛ (حبْر الأمّة): (إبـن عبـاس)، (كعب الأحبـار)، (وهـب بـن مُنبّه)وەکـی (إبـن جريـر)ئەفـەرمووێ: " لايـان وايـه (رسـول)ی خـوان. (وحِبـر المُحَـدثي)و (بحـر العلـوم)وه (إبـن تيميـه)ش ئـەوەيان (إختيار)کرديه؛ (بِناءاً على هذا) (تأويل)ی (عبارەت)ی قرآن خـەيلی بـێ (معنـا )يە؛ وە ئەفسوسه کە (قرآن)بکرێتە، (تابع)ی (حکايات)؛ بەڵێ ئەگەر (رُسل)ی

(عیسی)بن درۆ زۆر هەلّ ئەگرێ، بۆیە (بعض)ێ (إختیار)یان کردیە: ئەوانە (رسول)ی (عیسی)بوون. بەڵەك و کۆیان چا ئەکردەوە لە (خازن)ی ئەلّێ: " قوڕیان دەهێنا، خڕیان ئەکردەوە، وەکی کەلا، ئەیان هاوێشتە جێ چاو، دەستیان پێدا دێنا ئەبوە چاو" ( یاربّی)ئەمە چیە؟ چاو چۆن ئەبێ؟ وەلە چ (مادّە)یە ئەبێ؟ وە چ (دقایق)ی (صنع)و (إیجاد)ی تیایە؟ (عقل) (حیران)ە؛ چۆن قوڕ ئەبێ بەچاوو؟! نازانم کە (کرامەت)و (مُعجزە) هاتە گۆڕێ، بەجارێ هەموو (قاعدە)و (قانون)ی (خلق)و (إ یجاد)و (صُنع)ئەگۆڕێ؛ هیچ نامێنێ؛ ئەگەر لێ ی گەڕێن، خوا ئیشی خۆی (حسب القواعد)ئەکا؛ چاو ئەوەتە زۆر (مألوف)ی (إنسان)ە، نای نۆڕێتێ، وە (إلاّ)چاو (آیة)ێکە لە (أعظم)ی (آیات)ی (إلهی)، لە (أدقّ)ی (صُنع)ی (حساب)ە سەراپا بنۆڕە، چ باسی(معجزە)ی ئەو (رسول)آنە، لە (قرآن)دا هەیە؟ ﴿إِذْ أَرْسَلْنَا إِلَيْهِمُ اثْنَيْنِ﴾ لە (أوّل)ەوە دووبوون؛ (حقیقةً) (تأویل)ی (آیات)بۆ (روایات)نا (صحیح)بێ (معنا)یە؛ (لله الحمد)ئەو (خرافات)ی (نقل)یا کردیە، هیچی لە پێغەمبەرەوە نیە؛ ناویان چ بوە؟ چ پەکم لەسەری کەوتوە! ﴿فَكَذَّبُوهُمَا﴾ دەر( عَقب)﴿فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ﴾ (تقویە)مان دان، بە (شخص)ی سێ یەم﴿فَقَالُوا﴾ تێکڕا، وێکڕا (مُتّفقَ الكلمة)﴿ إِنَّا إِلَيْكُم مُّرْسَلُونَ﴾ لە (طرف)خوای ﴿قَالُوا مَا أَنتُمْ إِلاَّ بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾ چ (معنا) ئێوە (رسول)ن، بۆسەر مە ناردراون؟ چ (إمتیاز)تان لەسەر ئێمە نیە﴿وَمَا أَنزَلَ الرَّحْمن﴾ وەکی ئێوە ئەلّێن:" ئێمە لە (طرف) (رحمن الرحیم)هاتووین" (إرسال)ی (رسول)لەڕووی (ڕەحمەت)ە، لەبەر (إحتیاج)ی نیە ﴿مِن شَيْءٍ﴾ (أوّل)و (آخر)هیچی بۆ کەس نەناردیە؛ (ممکن)ە بلّێن:" (مُقتضی)ی (رحمانی) (تکلیف)نەکردنە" ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلاَّ تَكْذِبُونَ﴾ هەردرۆ ئەکەن ﴿قَالُوا رَبُّنَا﴾ ئی خۆیان، یا ئی وانیش ﴿يَعْلَمُ إِنَّا إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ﴾ بە (تأکید)ی (أکید)﴿وَمَا عَلَيْنَا إِلاَّ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ﴾ وا دەر ئەکەوێ ئەوان (طلب)ی (آیات)یان نەرکردیە، ئەمانەش چ (آیات)یان بۆ

نەنواندینە؛ (وظفة)ی خۆیان، کە (تبلیغ)ە، بە (وجە)یَ (واضح)بە جیّ هیّنایە؛ (دەخیل)ەکەم تا (ممکن)تان ئەبیّ، (تأویل)ی (آیة)بۆ (حکایەت)مەکەن ئەگەر (روایەت)ی (صحیح)، (معقول)لە (حضرة رسول) (ثابت)بوو؛ قەی نیە؛ (صرف)ی (آیة)ی بۆ بکریّ، ئەگەر (تحمّل)بکا، (وإلاّ) (أصل) (قرآن)ە، (قیمەت)ی (حدیث)بەسایەی (قرآن)ەوەیە ﴿قَالُوا﴾ (أهل القریە)﴿إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ﴾ (تشأم)مان بەئیّوە کردیە؛ (نحس)ن وەکی کوندە بو، یاقەل کە ئەقیڕیّنیّ؛ توخوا کەسیّ مردی زیندی کاتەوە (إبرا)ی (أکمە)و (أبرص)بکا، وای پیّ ئەڵیّن؟ ئەبیّ ئەو (قوم)ە (بعض)ە (مصائب)یان بەسەرا هاتبیّ، وەکی (قوم)ی (فرعون)، (تطیر)یان بە (موسی)وە (من مَعَه)وی ئەکرد﴿لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا﴾ لە(دەعوەت)ی ئیّمە ﴿لَنَرْجُمَنَّكُمْ﴾ بەردەبارانتان ئەکەین؛ (تفسیر)ی بە جویّن پیّدان لام وایە جوان نیە؛ گەرچی (مُجاهد)کە (تفسیر)ی واکردیە، (رعایەت)ی (ظاهر)ی ﴿وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ی

کردیە؛ زیّرا ـ (بعد الرّجم)ئەگەر وەکی (رجم)ی (حدّ)ی (رجم)کرای بیّ، نامیّنن؛ تا (عذاب)ی (ألیم)یان پیّ بکا نەتان کوژین، بە (رجم)، (عذاب)تان ئەدەین، (عذاب)یَ بە ئیّش؛ نازانم (مَسّ)چۆن (تفسر)کەم؟ (تفریق)لە (بین)ی (عذاب)ی (روحانی)و (جسمانی) (نظر)بە بت پەرستان ئەبیّ؟ ئەگەر (عذاب)ی (روحی)یان هەبا، ئەیان زانی (عبادەت)ی (أصنام)چ (عذاب)یَ (ألیم)ە، بۆ (إنسان) (روح)دار ﴿قَالُوا﴾ (رُسُل)﴿ طَائِرُكُم﴾ (شوم)ی خۆتان ﴿مَعَكُمْ﴾ لەگەڵ خۆتانە ﴿أَئِن ذُكِّرْتُم﴾ (إستفهام)و (شرط)گردبوینەوە؛ ئایا لەبەر ئەوەندە، کە ئیّمە (إرشاد)تان ئەکەین؛ ئەتان ترسیّنین، بەیادتان ئەخەین؛ ئەو (تهدید)ە نو (غضب)ە، نو (تطیّر)بە (شوم)زانینی لە ئیّمە، ئەو (رجم)و (عذاب)ە، چی وامان نەکردیە، (مُوجب)ی ئەو (أحوالات)ەبیّ؟ ئەوی بەسەرتان دادیّ، لەبەر (شوم)ی مە نیە ﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ﴾ (تجاوز)لە (حد)پیشەتانە لەبەر (عصیان)و (فسق)و (فجور)و (سهر)و (قمار)و (شراب)و

(رقص)و سەما، ئاگاتان لە (مصالح)ی (دنیا)ش نەماوە ﴿وَجَاءَ مِنْ أَقْصَى﴾ لە دووری ﴿الْمَدِينَةِ﴾ شاری ﴿رَجُلٌ﴾ پیاوێ، مەردێ گەورە، یاخود نەناسراو، (رسول)ەکان نەیاندەناسی و (معارفه)یان نەبوو، تا (توهّم)بچی ئەوەی دەی فەرموێ، لە (تدبیر)بێ ﴿يَسْعَى﴾ غاری ئەدا؛ خێرا ئەهات؛ ئەو (رجل)ە، هەروەکی بە (مجهول) (ذکر)کرایە، (حقیقةً) (مجهول)ماوەتەوە؛ (نقل)لە (حبر)آن ئەکەن؛ ناوی (حبیب)بوە؛ ئەبێ ترجمەبێ، وە (إلاّ)ناوی (عربی)لەناو ئەو (قوم)ە، چی ئەکا؟ خۆی (حبیب)، ناوی بابی (إسرائیل)، یا (مُرّی)، کوائەبی یەکێ ئەڵێ: " (نجّار)بوو" یەکێ ئەڵێ " (حرّاث)" یەکێ ئەڵێ:" (قصّار)" (قیل): " پینەدۆز" (قیل):" (نحّات)ی (أصنام)؛ (هیکل)تراش" قسەیە دوورو بێ (معنا)و بێ (فائدە). ئەڵێن:" یەکێکە، لەو سێ یانەی(سابقی) (إلی الأسلام).

دووەم: (مؤمن)ی (آل فرعون).

سێ یەم: (إمام)ی (علی)" (علم)بە (أولیّات) (نظر)بە (أمم)ی (سابقه)، نابێ؛ ئێستا (ممکن)ە؛ (عالم)ئاگاداری (أحوال)ی یەکن (نسبەت)ی(حضرة)ی (علی)لەگەڵ (رسول الله)وەکی (نسبەت)ی ئەو (شخص)ە لەگەڵ (رُسُل)، وە(مؤمن)ی (آل فرعون)لەگەڵ (موسی)نەبوە (حکایات)زۆرن، ڕاستی کەمە؛ خۆبە (توجیه)ی (روایات)ی (متناقضه)مادی کردن ئەوانە چاوە نۆر نەبووین، (ترقّب)ی کەسیان نەکردیە بۆی (مِنْ أقصی) (تقدیم)ئەکا لە (رَجُل)؛ لە (حادثه)ی (موسی)، چونکی (موسی) (مُترقبّ)بوە؛ کەسێ بێ، (خبرات)ی پێ بێ(رجل)ی (تقدیم)کردیە؛ (علما)ی (بلاغەت)وا ئەفەموون، وە(بعض)ێ (توجیهات)ی تریشیان، فەرمووە: ﴿قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ﴾ کە گەیشتە لایان بە (قوم)ی خۆی فەرموو (إتباع)ی ئەو (رسول)آنە بکەن، دوایان کەون ﴿اتَّبِعُوا مَن لَّا يَسْأَلُكُمْ أَجْرًا﴾ چتان لێ (طلب)ناکەن، وەکی (سائر)ی (رُسل)، (أجر)ی خۆیان لە خوا ئەوێ.

گەلێ کەس دێن، بە (عبادەت) (مشغول)ئەبن، چیان ناوێ، بەڵکو ئەگەر شتیان بۆ ببەن توڕە ئەبن (ردّ)ی ئەکەنەوە؛ تا دڵ لە خەڵکی وئەستێنن، ئەبنە (مُعتَقَد)ئەوجا ئەوی ئەی کا، ئەی کا ﴿وَهُم مُهْتَدُونَ﴾ ئەوانە (ثابت)ن لەسەر ڕێ ی ڕاست، بێ (حیلە)ن؛ دیارە شارەزایان بوە، بە (سرّ)و (عَلَن)یان کەوتیە، (صداقەت)ی وانی، لێ (معلوم)بوە ﴿وَمَا لِيَ﴾ (سبب)، (موجب)لەبەرچی؟ ﴿لاَ أعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي﴾ منی (خلق)کردیە، (کلام)ێ (خێر)خوا هانەیە؛ بۆ خۆی چ (خێر)ێکی ئەوی، بۆ (قوم)یش ئەوەی ئەوێ ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (مبدأ)و منتهی ئەوە. (بعض)ێ ئەفەرموون:" (آیة)لە (إحتباك)ە، تەواوی (کلام) (مَالِيَ لَا اعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي وَ إِلَيْهِ أرْجِعُ؛ وَمَالَكُمْ لاَ تَعْبُدُونَ الَّذِي فَطَرَكُمْ وَ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ؟)" ئایا ئەو (إیجازە)لە (کلام)ی وی دایە، یالە (کلام)ی خوا؟ نازانم وەلام وایە، (مقام)، (مقام)ی (صنعه الاحتباك)ی (علمی بدیع)نیە؛ وە (إیجاب)ئەکا، (آیة)﴿أأتَّخِذُ مِن دُونِهِ آلِهَةً﴾ بکرێ بە (إحتباك)﴿أأتَّخِذُ ...إلخ﴾ (تقدیر)بکرێ. (حاصل)ی (مختار)ی (جمهور) (مختار)ە؛ (سعد الدین)و (أمثال)ی قسەیان لە (تحقیق)ی (آیة)جوانە، وە زۆە؛ ئەگەر (تعریض)ە.

کەسێ (إتخاذ)ی (إله)بکا، ئەبێ (إتخاذ)ی (آلِهَة)بکا (لاتُعدُّ ولاتُحصی)؛ زیرا (وجە)ی (ترجیح)نیە، مەگەر (حسب الظاهر) (شمس)ئەویش (حاجەت)بە (تمثیل)ناکا، خۆی هەموو ڕۆژێ دەرئەکەوێ؛ (بَعْدَهُ)بزر ئەبێ، (وهکذا). چ (معنا)ی نیە مانگ بپەرسترێ، ڕۆژ نەپەرسترێ ﴿إِن يُرِدْنِ الرَّحْمَن﴾ خودا وەندی (عظیم الشأن)ی بێ (شریك)﴿بِضُرٍّ﴾(إرادە)بکا، (ضرر)ەکم تووشی ببی؛ ﴿لاَّ تُغْنِ عَنِّي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا﴾ هیچ (نفع)م ناداتێ، (شفاعەت)یان پێ ناکرێ؛ (جماد)پێ ئەکرێ؟ ئەدی (مُمثَّل)ی (موهوم)خۆی نیە، (شفاعەت)ی چۆن ئەبێ؟! وەکی (منطقی)ئەفەرموون: " (سالبة) (صدق)ێ دێ، لەگەڵ (إنتفا)ی (موضوع)" ﴿وَلاَ يُنقِذُونِ﴾ (خلاص)م ناکەن، بۆچی (إتخاذ)یان

کەین، بە (إلهە)؟ ﴿إِنِّي إِذًا﴾ (علی التقدیر الإتخاذ)﴿لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾گومڕایی ئاشکرا؛ (سجدە)و (ڕکوع)بۆ گاجووت ببەی؛ (بَعْدَهُ)بیکوژنەوە، پارچە پارچەی بکەن، بی شارنەوە، وەکی (ملوك)آن، (احتفال)ی بۆ بکەن؛ ﴿إِنِّي آمَنتُ بِرَبِّكُمْ﴾(ربّ)ی (حقیقی)﴿ فَاسْمَعُونِ﴾وتیان: گوێتان لێ بێ (عَلی مَلاء النّاس)وەکی (عُمَر)ی (فاروق) (إعلان)ی (إیمان)ی ئەکا، بێ (خوف)و بێ هەراس. (توجیە)ی (خطاب)بۆ (رسول)ەکان (معناً)جوانە؛ (أمّا)لە (ظاهر)ی (سیاق)دوورە. پاش ئەو (إعلان)ەی (حُرّ)و دلێرانە، لە (طرف) (جناب)ی (حق) (ندا)ی کرایە﴿قِيلَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ﴾ (حجاب)نەما، (ممکن)ە ئەو (ندا)یەیان بیستبی ﴿قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ﴾ خۆزیا (قوم)ی من بیانزانیبا ﴿بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي﴾ (سبب)ی چیە؟ (إیمان)ە بە (وحدانیة)ی (إلهی)؛ ئەوان لێ ی دوورن؛ (طبیعی)ئەگەر بیان زانیبا، (إیمان)یان ئێنا ﴿وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ﴾ ئەفەرموون: "(قوم)ئەو (ذات)ەیان کوشت" (عرض)ی (دخول)و (تمنا)ی زاناندنی (قوم)، لە (طرف) (روح)ی (شهیدانی)بوە؛ (ممکن)ە ئەگەر بتوان (حمل)ی (جنّة)بکەینە، سەر(جنة)ی (روحی)، (لذّەت)ی (روحانی )چەند جوانە. زۆ جار ووتومە:" ئێمە (لذّەت)لە (إیمان)بە (وحدانیەت)ی (إلهی)، تەنهالە (عبادات)کردنی ئەکەین، ئەو نابینیی؛ (أمّا)کەسێ دوێنێ (مقابل)ی کەرێ گایە، (تمثال)یێ، (خاضِع الرّقبە) (ناكِس البصر)لەسەر (قدم)ی (ذلّ)و (إنکسار)ڕاوەستێ، بیەی (إیمان)بە (وحدانیەت)ی خوایە، بێ (شیبە)و (شریك)و (علاّم)و (قدیر)، دارندەیی (کائنات)؛ بێنێ؛ ئەو زانی ئەو (إیمان)چ (لذّەت)ەکی هەیە؛ چ (کرامەت)و گەورەیەکی تێایە؛ بنۆڕە لە چ (ذِلەت)یێ بۆ چ (عِزّەت)یێ ئەڕوا ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ﴾ (حقاً) (مؤمن) (عزّەت)ی (نفسی)نەبێ بە (مؤمن) (حساب )نیە؛ (بعض)یێ لە (أتباع)ی (صوفی)یان، لە (هتك)ی (نفس)بە (غلط)چووین؛ (ریاضة)ی (نفس)بۆ (عِزّەت)ی (نفس)ە؛ (حتّی)بە (منع)لە خواردن و خواردنەوەو (لذائذ)، بۆ (مقام)ی (صمدانی)

(توجیه)ی پێ ئەکا؛ ڕۆژی خورش کردن و شەقتێ هەڵدان و با بەرەڵا کردن، کاری (مؤمن)نیە (لاّ یَنبَغِي لِلْمُؤْمِنِيَ أنْ يذلّ نفسه) بەڵێ هەرچی بکەوێتە دەست نا (أهل)تێکی ئەدات ﴿وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى قَوْمِهِ مِن بَعْدِهِ﴾ پاش (وفات)ی بەهەر (نوع)ێ بووبێ ﴿مِنْ جُندٍ مِّنَ السَّمَاءِ﴾ (قوم)ێ ئەوەندە (قوی) نەبوون، لەشکریان بێتە سەر؛ (غرور)ێ (جاهلانە) (سوق)ی کردن، بۆ (کفر)و (ضلال)و سەرکەشی﴿وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ﴾ (سابقاً)هیچ (أمّەت)ی شایانی وەی نەبوە، لە(طرف)ئێمە لەشکری بکرێتە سەر ﴿إِن كَانَتْ إِلاَّ صَيْحَةً وَاحِدَةً﴾ (مَلَك)ێ بەسەریاندا هاڕاندیتی، بەیەك (صَحیة)مردینە ﴿فَإِذَا هُمْ خَامِدُونَ﴾ دامردن، کوژانەوە، ساردبوونەوە؛ بوون بە خۆڵە مێش (ممکن)ە لەبەر بێ (أهمیەت)ی وان بێ (إبن مسعود) (زیقە)ئەخوێنێتەوە؛ وەك قووقەی کەڵە بابی؛ (ظاهر)وایە (زیقە)نەگا بە (صیحە)؛ (واقعاً) (إنسان)وەك (فانوس)ێکە پێ کرای تا(موادّ)ی (محترقە)ی لە ناو (هیکل)ی، بە (إنتظام)بسوتێ (حیات)ی (دوام)ئەکا؛ کە(إنتظام)ی چوو، (حیات)تێك ئەچێ کە کوژاروە، (حیات)نامێنێ، وە (هیکل)ی بۆگەنی ئەبێ، ئەڕزێ وەکی خۆڵە مێشێ لێ دێ﴿يَا حَسْرَةً عَلَى الْعِبَادِ﴾ پەشیمانیان لەسەر ئێ ئەندۆەو غەم، (حاضر)بە لەسەریان ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ﴾ هەرکێ بێ ﴿إِلاَّ كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِؤُونَ﴾گەمەی پێ ئەکەن خۆیان لاگەورەیە؛ (رسول)یان لا سووکە؛ قەشمەری پێ ئەکەن ئەمرۆش کەسێ لە ڕوی (نُصح)ەوە، (إرشاد)ی ئەو (نوع)ە (عباد)ە، بەد نهادانە بکا، گەمەی پێ ئەکەن. ئەو (دَیَن)ە بۆ (قوم)ی (قُریش) (أُنّە)بوە بە (إرث)؛ ئەوانیش (إستهزاء)بە (جنابی رسول)ی (مُجتبا)ئەکەن ﴿أَلَمْ يَرَوْا﴾نەیاندیە؛ نەیان بیستیە، نەیانزانیە؟ ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم﴾(أهل)ی (مکە)﴿مِّنْ الْقُرُونِ﴾زۆر، بێ (حساب)﴿أَنَّهُمْ﴾ (قرون)ەکان ﴿إِلَيْهِمْ﴾ بۆ لای (أهل)ی (مکّە)، (سادات)ی (قُریش)﴿لاَ يَرْجِعُونَ﴾ ناگەڕێنەوە؛ (قرائەت)ی (إنَّ) بە(کسرە) (من حیث الترکیب) (راحەت)ە؛ (قرائەت)ی (أنَّ)بە

(فتحه)نەختێ (إضطراب)ئەدا، وە (خلاف)یان، تەواوێکە. لە (نظر) (حقیر)ئەو (معنا)یە، کە (مُختار)ە، لای (مُحققین)آن، خۆی نیە؛ زێرا ئەوانە، چ (إدعا)ی وایان نیە، ئەوانی ڕابردوو، ئەگەڕێنەوە، (رجوع)یان بۆلای وانە ئەبێ؛ بەڵکی بالعکس، وەکی لە(سورەت)دەرئەکەوێ؛ ئەوانە (إنکار)ی زیندی بوونەوە، ئەکەن؛ وە (أکثر)ی (أقوام)لە (رسول)یان ئەخوازن ﴿فَأْتُوا بِآبَائِنَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ (معنا) یەتریش ئەفەرمووێ؛ (إمامی رازی)، گویا (مُراد)لە (نفی)ی (جوع) (رجوع)ێ (نسبی)یە (یعنی)ئەوانەی بە (هلاك)چووین، کەسیان نەماوە، بە خزمایەتی بگەڕێتەوە سەر ئەمانە؛ ئەمەش لام خۆش نیە وەچەند (وُجوە)ێ تریش، (سیّد) (صاحب)ی (روح المعانی) (بیان)ی ئەکا؛ بەکەمیان (راضی)یە. چەند ڕۆژە، ئەمن لەسەر ئەو (آیة)ە ڕاوەستایم، بە (معنا)ی وان (قائل)نیە، وە خۆشم چی وام بۆ نەهاتوە، دڵم پێ ی ڕاوەستی آخری وام بۆ (ظاهر)بو، (بالعکس)، (ضمیر)ی (أَنَّهُمْ)بۆ (أهل)ی (مکە)؛ (ضمیر)ی (إلیهم)بو (قرون)ی (بائدە)و (هالکە)بچێتەوە؛ (أَنَّهُ)ڕوشی (أحوال)یان وا ئەگەیەنێ، ئەمانە (رجوع)یان بۆلای ئەوانی ڕابردوو نابێ؛ نامرن، بە (هلاك)ناچن ﴿وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ﴾هەموویان - (أوّلین)و (آخرین)؛ ئەماننە و (أقوام)ی (هالکە)؛ ئەفەرموون:" (لَمَّا)بە (معنا) (إلاّ)یە" (وَلَوْ) (کسائی)ش فەرموویەتی؛ من ئەوە نازانم؛ گشتیان لای ئێمە (حاضر)ئەکرین؛ بۆ (حساب)و (جزا)یا (عذاب)ئەدرێ، چونکی قسە لەگەڵ (کافر)ەکانە، (کُلّ)کە ئەوانن ﴿وَآيَةٌ لَّهُمُ﴾ بۆ ئەوانە ﴿الْأَرْضُ الْمَيْتَةُ﴾ مردی؛ وەکی ئیستای هاوینێ؛ هیشك، سووتای، لەبەر (حرارة)ی ڕۆژێ ﴿أَحْيَيْنَاهَا﴾ بارانی بەسەر ئەبارێنێ؛ (قُوە)ی (إنباتی)ی بە (حرکە)ئەکەوێ؛ گیا و گوڵ شین ئەبێ ﴿وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا﴾لە (أرض)ی زیندی کرایەوە﴿حَبًّا﴾دانە؛ گەنم و جۆ؛ نۆك و نیسك، (هرطمان)﴿فَمِنْهُ﴾لە (حبّە)کە﴿ يَأْكُلُونَ﴾ و پێ ی ئەژیەن؛ لە (ترکیب)ی ئەو (آیة)ە، قسەیان هەیە ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا﴾ لە (أرض)ی (جنّات)باغات ﴿مِن نَّخِيلٍ﴾ (جمعُ

نخلە)دار خورما ﴿وَأَعْنَابٍ﴾ دری تریێ؛ (تفسیر)ی یەکی بەدار، وەیەکێ بە میوەی؛ وەکی (سیّدی آلوسی)ئەفەرمووێ؛ دووره ﴿وَفَجَّرْنَا فِيهَا﴾دەرمان کولاّندیه، له عەردی ﴿مِنْ الْعُيُونِ﴾لەکانی یا ﴿لِيَأْكُلُوا مِن ثَمَرِهِ﴾ (ثَمر)ی (کُلّ)یێ لەداری خورما و داری تریێ؛ (رجوع)ی (ضمیر)بۆ ئاو ـ کەلە (عیون) (مُستفاده)؛ دور نیه؛ (حقیقةً)داری بەبەر، کە ئاودێ، (ثمر)ی دەها شایانی خواردنه؛ داری مێو بێ ئاو ئەبێ؛ (أمّا)نازانم خورما بێ ئاو ئەژیه؟ بڕوا ناکەم ﴿وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ﴾ دۆشاو، باسوق، یا ئی دەست چێنیان و ئاو دانیان، بە (دلو)و (ناعور)و ئەمانە؛ وە (ممکن)ە (ما) (نافیە)بێ؛ (لکن)باغات؛ بێ (عمل)ی (بشری)خۆی نیه؛ (غابات)ە جەنگەڵستانه ﴿أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾دیاره ئەوانه بە هەر دوو (معنا) (کافرن)﴿ سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ﴾ نێرو مێ ﴿كُلَّهَا﴾ هەمووی ﴿مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ﴾لە دارو (نباتات)ی (مثمرة)﴿وَمِنْ أَنفُسِهِمْ﴾لە خۆیا ﴿وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ﴾ ئەوەی نایزانن، زۆره؛ ئەز (جملە) (میقرۆب)کەلەو نێزیکە (کشف)کرایه (سبحان الله)ئەو (آیة)ە، (آیة)یێ (عظیمة)؛ (حقّاً)له (معجزات)ی (علم)ی (رسول)ی (کبریا)یە؛ (تفصلات)یێ زۆری گەر کە؛ (أمّا) (مجملاً) (عرض)ئەکرێ؛ (بشر) (ترقّی)کرد کەوتە، (أوج)ی (إختراع)و (کشفیات)، ئەوجا (سرامدان)ی (حکمەت) زاناندیان، (ثمرات)و (حبوبات)وەکی (حیوانات) (محصول)ی (زواج)ە ئەوەی (مُثمر)و (مُنتج)بێ، لە (عالَم)ی (نباتات)و (أشجار)و (حیوانات)دوو (قسم)ن؛ نێرو مێ ـ من گەلێ جار لە (آیات)ی (قرآنی)وەرم ئەگرت ـ تاکو لە (رسائل)ی (حُکما)ی (غرب) (مُفضلاً)دین، (شُکر)ی خوام کرد؛ (طنطاوی)لەگەلێ جێ، له (تفسیر)ی خۆی، باسی ئەو (مسئله)ئەفەرمووێ: (مقالات)ی جوان جوان، لە (عُلما)ی (غرب) (نقل)ئەکا؛ (حقیقةً) (تحقیقات)یان (مُحَيِّرة)؛ (حیوان)بە (غریزه)، بە (شعور)ێ ی بە (لِقاح)برد؛ نازانم چۆنیان زانی؛ (لِقاح)ی خورما بەردارو (مُثمِر)چۆن ئەکرێ؟ بە (تدبیر)ی (صانع)ی (حقیقی)، بە (واسطة)ی:

(ریاح)تۆی لەناو گەلیٚ نێر، ئەهاویتە ناو گەلی مێ؛ لەوی (ثمرة) (تكوّن)ئەكات؛ (سعدی)ئەڵێ: "بەرگی درەختان سەبزە ست دەر (نظر)ی (هوشیار) هەر (ورق)یٚ (دفتر)یست (صُنعەت)ی پەروەردگار!"

ئەگەر تەماشای (طریق)ی (تكوین)وی (ثمرة)بكەی، هەردانە، چەند (دفتر)ێكە، لە (فَوق)ی (طوماری) (أفلاطون)ی (مع الأسف)چەند ساڵە، (خصوص)ئەمساڵ، ترێ لە ووڵاتی ئێمە (آفات)ی هەیە؛ هەم هورەی ئەی با، هەم ژەنگ لیٚ ی ئەدا بیٚ كەڵك ئەڕوا! ئومێدم وایە (صاحب)ی ئەو (آیة)ە (رحم)یٚ بكا؛ دەردرو بەلاّمان لەسەر هەلٚ گریٚ؛ (سبحان الله) (نَبی)یە (أُمّی)یە (وحی)ی (إلهی)ئەو (دقّەت)و (صُنع)و (تكوینە)ئەزانیٚ؛ (حُكما)و (عُلما)لیٚ ی (غافل)بوون، تا لەو (آخر)ە (كشف)كا. (أمّا)شتیٚ هەیە، (عجایب)ە لە ووڵاتی مە: دۆشاو دروست ئەكەن، گڵی سپی هەیە ئەیهاوێنیٚ ناو مەنجەڵی سۆراوی تریٚ تیٚ ئەگەڵیٚ غیری (مادەی) (سُكر)یٚ (مواد)ی تر فریٚ ئەدا دوای (تصفیە)ی ئەكەن ئەبێتە، دۆشاوی شیرن؛ چۆنیان زانی، دۆشاو بە و گڵە ئەكریٚ؟ (مفتاح)یان چۆن دۆزیەوە؟ گەلێكم (سؤال)ی كردیە، كەس نەیتوانیە، (جواب)داتەوە ئەوانیش وەكی (حیرەت)ماین ﴿وَآيَةٌ لَهُمْ﴾بۆ ئەوان (وَسائر)ی (أنام)یش وەكی وانن ﴿اللَّيْلُ﴾شەو ﴿نَسْلَخُ مِنْهُ النَّهَارَ﴾ (أنَّهُ)و كەوڵی ئەكەین، ڕۆژی لەسەر لا ئەدەین (ذاتاً)شەو (محاط)ە بەڕۆژ؛ (دائماً) (نوی) (شمس) (أطراف)ی گرتوە؛ (ظِلّ)ی (أرض)ی لەناو ویدایە﴿فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ﴾بۆیە (مفاجئە)ی تاریكی (مُستغرب)ە؛ (خصوص)كەبلیٚ: " (نور) (ذرات)ی (منفصل)ن لە(شمس)كەڕۆژ ئاوابوو، بە (مُدّە)یەكەم، ئەو هەموو ملیارئەندەر ملیار، ترلیۆن ئەندەر ترلیۆن، چی لیٚ دیٚ؟! (أمّا) (سلخ)بكەیە گروونی ڕۆژیٚ، لەناو شەوی دەرێنی، من ڕام لیٚ نیە؛ هەرچی (قول)ی (شێخ عبد القاهر)و (صاحبی مفتاح)ە وە (سعدی أكبر) (تقویە)ی فەرمووە (تفصیلات)ی لە (مُطوّل)و (حواشی)ی (مطوّل)و (تفسیر)ی (سیّدی آلووسی)دایە؛

(حُکما)ئەڵێن:" (ضیا)ی (شمس) (مُرکّب)ە لە حەوت (لون)، کە لە (کەسك و سوور)دەرئەکەوی؛ (أرض) (ضیا)ی (شمس)قووت ئەدا، (ألوان)ەکان ـ بە (بَسیطی)یا (مُرکّبی)لە گڵووك و (أوراق)و (أثما)و (حبوب)دەرئەکەویّ" (سبحان الله)تا (أسا)ی (کَون)دەرکەوی، (عاقل) (إیمان)ی بە (علم)و (قدرەت)ی (صانع)، (زیاد)و بە (قوەت)و (راسخ)ئەبیّ ﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا﴾ (قوەت)و (عظمة)و (منفعە)ی (شمس)، بە ئێمە نایەتە (تحریر).

(عُلمای) (جدید)ی (علم)ی (هیئەت)، هەر ڕۆژ ـ (دائم)بە (أحوالات)ی (شمس) (عجایبات)، (نشر)ئەکەن؛ (طنطاوی)خوا (سلامەت)ی ئەکا لە گەڵیّ جیّ (نقل)یا لیّ دەکات؛ (ذاتا)ئەو (أساتذة)ی (مکاتب)ی (رسمیە)، (عموم)ی شارەزای (هیئەت)ی (جدید)ن؛ لە(دەورە)ی (حرکە)ئەکات" (حاشا) (مادّی)و (معنوی) (أرض)ئەو (قیمەت)ەی نیە، (فَلَكُ الثَّوابِت)و (فَلَك الأفلاك)لە (دەور)ی بوخلێنەوە؛ (فلك)ی (بسیط)ی ـ (مُحَدِّید الجهات)لای (حکما)ی (جدید)نا (موجود)ە؛ ئەوەی (موجود)ە، (مُرکّب)ە (شمس)لایان (ساکنە)؛ (مرکز)ی (منظومة)ی خۆیەتی؛ (أوّل) (عطارد)، (ثُم) (زُهرة)، (ثُم الأرض)، (ثمَّ) (مرّیخ) (ثُم)(مشتری)(ثُمّ) (بعض)یّ (سیّارات)ی تر کەلە نویّ ی پی (کشف)کراین، بە (دەورە)ی ڕۆژا (حرکە)ئەکەن (علیە)ئەم (جریان )ی (شمس)ە چیە؟ دوو (وَجە) (ممکن)ە (أوّل) (شمس) (مایع)یّ (ناری)یە، (دائم الجریان)ە وەکی ئاو ئەو (معادن)ی تیایەتی، لەبەر (حرارەت)تاواوەتەوە؛ شلە وەکی (دۆشاو)؛ ئەو (حرکە) (دوام)دەکات، تا (قوەت)ی کەم دەبیّ، ڕائەوەستیّ؛ ئەو (وەقت)ە (نظام)ی (شمس)ئەگۆڕیّ؛ ئەبێتەوە (طور)یّ تر؛ خوا ئەزانیّ چۆن ئەبیّ! دووەم: (شمس)لەگەڵ (منظومة)ی خۆی بۆ (طرف)ی (مجرَّە)ئەڕوا، تا ئەگاتە (مَقرّ)ی خۆی؛ ئەو (وەقت)ە، ئەوەستیّ؛ خوا ئەزانیّ (منظومة)چی بەسەر دیّ؛ وەئەشێلن:" (کُلّ)ی (کُرە)یە، (حرکە)ی (حول المرکز)ی خۆی هەیە" (عُلما)ی (قدیم)وەکی (فخرالدینی رازی)وە (أتباع)ی وە (أشیاع)؛ (حتّی)

(سیّد آلووسی)لەسەر (نهج)ی (هیئەت)ی (قدیم)، (تفسیر)ی (آیة)یان کردوە؛ (لکن) (تغییر)ی (نظم)کە نافەرمووێ (وَآيَةٌ لَهُمُ)وە (خاتمة)ی (آیة)لەسەر ﴿ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾(طرز)ێ نوێ ئەکەیەنی؛ گوێ گرە لەقسەی (نُقّال)آن؛ ئەو (شمس)ی وا (عظیم)یان، کوو کردیتە قوتوو لەی (قلم)و زوبانیان؟ بۆ (شعاع)ی (شمس)و (نور)ی پەکی (عیسی)ی (رسول)ی (ملاّح)ە؛ ئەدی پێش (عیسی)؟ (ماشاء الله) (هذا بهتانٌ عظیم) (شیّخ إسماعیلی حضرمی) (أمر)ی کردە (شمس): " ڕاوستە" ڕاوەستا! (إشارة)ی کرد؛ : " ئاوابە" ئابوو! (شێخ إسماعیل - سمایل)ی (عەودالآنی)خۆمان، حەوت سالآن جلوی ڕۆژی ڕاکیشا؛ (ملیۆن)ێ وەکی (إسماعیل)هەموو (أرض)و (کئنات)ی (نظر)بە (شمس)بەقەد دانە هەرزنێ نابێ؛ بە (قیاس)ی (قُبّە)یە (وسیع)و (رفیع)لە(نُزهة المجالیس)ئەلێ: " ناوی (حضرەتی أبو بکر)ی لەناو دلّی (شمس)نووسرایە؛ هەموو ڕۆژێ کە ئەگاتە، نیزیکی (سمت) ی (کعبە)، ئەیەوێ ڕاوەستێ؛ (یعنی) بەسەر (کعبە)یا تێ نەپەڕێ؛ (ملائکة)ەکانی جلەوکیش، سوێندی پێدائەدەن بە (حقّ)ی ئەوکەسەی ناوی لە ناوت نووسراوە؛ ئەرگە نەڕۆی ئەوجا ئەڕوا (وهکذا)قسەی هیچ و پووچیا زۆرە.

لە (حدیث)ی (تصحیح)کراو ئەلێ:" کەڕۆژ ئاوابوو، (جریان)ئەکات، بۆ (تحت)ی (عرش)ی خوا، ئەکەوێتە (سجدة)؛ گۆی ی لەبەر گوناهکاران، حەز ناکا، (طلوع)کاتەوە؛ خوا (أمر)ئەفەرموێ:" لە(مشرق)ی خۆت (طلوع)کەوە" تا (آخر)ی (أمر)پێ ئەکرێ لە (مغرب) (طلوع)کا، ئەو (وەقت) (قیامەت)نێزیک ئەبێ دەرکی (تۆبە)ئەگیرێ! " هەر چەند لە (طرف) (رُوات) (تصحیح)کراوە، وە (حقیقةً)ئەوەی پێغەمبەر فەرمووی بێتی، ئەبێ ڕاست بێ؛ (أمّا)لە (علم)ی (أصول)ئەفەرموێ:" ئەوەی بەدەرکەوت، وانیە، دیارە (مُختلف)؛ وەیاخود (توّهم)ێ هەیە، لە(طرف) (سُماع)و (نُقال)آن" ئەمڕۆ (حساب)ی (طلوع)و (غروب)ی (شمس) (کالشمس) (ظاهر)ە؛ (ساعەت)لەیەکی شەوی ئێرە لە

(مصر) بانگى (مغرب)ئەدات؛ بە (ڕاديۆ)گوێمان لێ يە، لە (كۆيە) (ساعەت)لە (لۆنەرە)لێ دەدات، ئەلێ:" ساعەت چوارە" لێرە حەوتى سبەينێ يە.

ئەلێن: " لە (عبارەت)ى (نبوى)دانيە، كە ئاوا بوو، ئەچێ بۆ (تحت)ى (عرش)" وەك: لە (تفسير)ى (آلوسى) (نقل)كرايە (ممكن)ە (مُراد)ى (رسول)ى (أكرم)و (أعلم) (سَير)ى (إلى المجَرّة)بێ؛ (حسب الحس)بە (حركە)ى (حاضرة)ى تێ گەيشنە بە (مناسبە)ى (كعبە)لەبەر (إيمان)ى (قوم)ێ وە زێدە لەئەندازەى دەرچوون، (عُلما)ى (شرع)ئەفەرموون: " ئەگەر (كعبە)لە جێ ى خۆى نەما (مثلاً)چوە (زيارەت)ى (وَلى)يەلە (أولياء الله)يان، لە نوێژدا، ڕوو لە (هوا)ى (موقع)ەكەى ئەكەين" وە ئەلێن: " چوە بۆ (زيارەت)؛ (بالفعل) (واقع)بوە" (لاشك)ئەمە (خرافات)ە بێ (أصل)و بێ (أساس)ە؛ سێصەد بوتى پێوە بوو، بۆ چى يەكێ فرێ ينەدان؟ تا (حضرەت)ى (خاتم الرسُل)لە (نجاسەت)ى (أصنام)پاكى كردەوە! (حاجەت)بە (تأويل)ى (ملا)يەكان و (صۆفى)يە گەورە گەورەكان نيە؛ (شمس) (شمس)ە؛ (كعبە) (كعبە)يە؛ (حقيقة)يان ىيارە؛ چ (ماهيەت)ێ (مجهول)يان نيە.

(حُكما)ى (جديد)ئەلێن: " (شموس)و (أقمار)زۆرن" وە (ملا)ى (طنطاوى)خوا بەر (قرار)ى كا، لە (تفسير)ى خۆى ئەى فەرموێ.

(ملا)يە (تونس)ى گۆيا ئەمە بە (كفر)ئەزانێ؛ (أنّهُ)خوا (نصّ)ى داناوە، (شمس)يەك، (قمر)يەك (تعّدد)ى نيە. ئەمە (كلام)ێ (جاهلان)ەيە، (ملا)يە وەكى (طنطاوى) (مسلّمان)و جگەر سۆز، بۆ (إسلامەتى)، چۆن بەو (نوع)ە قسە (تكفير)ئەكرێ؟ بەلێ ئەمە كۆنە (سلاح)ێكە بەدەست (ملا)يانى كۆنەوە؛ (لكن) (سلاح)ى كولە؛ (لاشك)بۆ خۆيان (ضرر)ە.

(متى)يە فەندى (رسالەت)ى هەى، بەناوى (سوپەرى صاعقە) چەند (فصل)ەكى تيايە، لەسەر (قول)ى (حكما)ى (فلك)و (طبيعة)ئەى فەرمووێ؛ دواى (كُلّ)ى (فصل) (ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ)ئە نوسێ؛ زۆرم پێ خۆش بوو

دیارە ئەم (تقدیر)و (ترتیب)و (ترکیب)و (صنع)و (تسخیر)ە لە (طرف) (ذات)ێ (غایـەت) (غالـب)و (عـالم)بـە (عِلـم)ێ (عملـی)، (صُـنعی)، (إیجـاد)کرایـە؛ لـە (طبیعة)ێ (جاهلی)یەوە نابێ؛ وە (تأثیر)ی (طبیعة)یش کە (مخلوق)ی خوایـە (إنکـار)نـاکرێ؛ یـەکی لـە (شـاهد)آن (سـوپەری صـاعقه)یـە وابـزانم (حرکـە)ی (لِمُسـتَقَر)جودایـە، لەگـەڵ (حرکـە) (إلی مُسـتقَر) (والله أعلـم)﴿وَالْقَمَـرَ قَـدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ﴾ مانگ (جُـرم)ێ (کـروی)بـێ (نـور)ە، خـاکی یـە؛ ئـەڵێن:" (أساساً)لـە (أرض)جودا بویتەوە" ئەوە زۆریش (معلوم)نیە؛ (لکن)بێ (نـور)ی وە (نـور)ی دانەوە بێ (شُبهه)یە؛ (أهل)ی (تقویم) (شاهد)ن؛ ئەگـەر (محـض)بـە (إرادە)ی (کبریائی)بێ، (مُنجم)چووزانێ؛ ئـەم سـاڵ (مـثلاً)مـانگ نـاگیرێ؛ یـا ئـەو سـاڵ دووجار ئەگیرێ. وە (باقی) (أوهام)و (خیالات)ی تر تورە هـاتن؛ ئێـوەی نـین، بنوسرێنەوە؛ (وَلَوْ)بۆ (رَد)لێدانیان بێ.

لەو ساڵانە رۆژ کەمەکی گیرا؛ (تقـویم)ی (إیـران)ئـەی ووت:" بیسـت مـانگ (نحوسەت)ی، (باقی)یە" بە (نورالدین)ی بـرام ووت:" لـەو قسـە ئەفامرێتـەوە، سـاڵی (آتـی )رۆژ نـاگیرێ" (حقیقـةً)وابـوو؛ وەلـە (تقـویم)ی (جدیـد)ووتیـان:" ناگیری" (عُلما)ی (مِلی)خۆرایی، خۆیان بە (رَدّ)ی ئەم (نـوع)ە (حقـائق)مـادنی ئەکـەن؛ ئەگـەر (شـریعەت)ی (وضـعی)یـە، ئەگـەر (طبیعـی)یـە، هـەردوو ئـی خوایەکن؛ (تنافی)یان نیە؛ (إلاّ)بە (إعتبار)ی (وهم)و (خیال)ی (ملیّون)آن نەبێ. (عبارەت)ی (قرانی) (صـریح)ە، کـە (قمـر)خـۆی بـە (منـازل) (تقـدیر)کـراوە! ئەگەرچی (علما)ی (تفسیر)و (هیئەت)، (منازل)بۆ (قمر) (تقدیر)ئەکەن، وەئـەو (منازل)آنە، (إعتباری)ن، مانگ لە هیچ (منزل)ێ دانابەزی، راناوەسـتێ، قۆنـاغ ناگرێ، (تفصیل)ی (منازل)ت ئەوێ؟ (مُراجعه)ی (کُتب)ی (هَیئـة)و (تفسـیر)ی (روح المعـانی) (سـیّدی آلـووسـی)بکـە. ئەگـەر قسـەی (أهـل)ی (فلکـی) (جدید)راست بێ، (قمر) (حیات)ی تیا بوە بە (مـرور)ی (أدوار) (حیـات)ی تیـا نەمایـە﴿حَتَّـى عَـادَ كَـالْعُرْجُونِ الْقَـدِيمِ﴾ (ممکـن)ە پـاش (إنقطـاع)ی (حیـات)

(نور)ی خۆی تەمابێ، بۆیە لە (أوّل)ی (شهر)، (شَکل)و ڕەنگی وەکی ڕەگی دار خورمای پیر، یا لاسقی ووشکی، یا باسکە لقی وردەلەی هیشك بووبێ، ئەنوێنێ. (أساساً)ڕگی دار خورما، (مدار)ی ((حیاتی)یە. (بعض)ی (أحکام)ی (حِسی)، (حِس)بەتەواوی پێ ی ناگا، بە(قوەت)ی (حدس)ئەزاندرێ، (أفلاطون)بە (قوە)یە (غریبە)، (أمّا)نایەبە؛ لای (ملیُّون)کەم دەست - ئەکەوێ، نایەڵێ، یاخود نەیەڵێ نیی؛ (لکن)لای (حکما)ی (طبیعة)و (کیمیا)و (فلك)هەیە؛ (أکثری) (إختراع)لە (إنتقال)ی (حدسی)یە، بێ (سبق)ی (تفکر)و (خیال)؛ من (مقالە)یە یا (رسالە)یەکم هەیە، (الحدسُ سُلَّمُ الإرتقاء) (حقاً)شایانی (مُطالعة)یە. (قدیم)یە (معنا)کۆنە؛ (مُقابل)ی نۆی و تازەیە؛ نەك (موجود)ی بێ (إبتداو)، (دائم) (مُستَمُّر الوجود)بێ (نهایة)﴿ لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ﴾(لایەق)ی وی نیە، (نباهەت)و (عظمة)ی (شمس) (موافق)نیە، لەگەڵ (سیر)و (حرکە)ی (قمر)؛ ئەم لە (دَور)ی (أرض)مانگی (دەور)ەکی ئەدات؛ (شمس) (مرکز)ە، هەموو (دەور)ی وی ئەدەن ﴿وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ﴾شەو (سبق)لەڕۆژ ناکا؛ شەو (دائماً) (مُحاط)ە بە (نهار)؛ (أرض)و سێبەری لەناو (نور)ی (شمس)دایە؛ تا (فلك)ی ( زُهرە) (إمتداد)ئەکاو بەس؛ لە (فلك)ی (قمر)ئەوەندە ئەستورە، کە(قمر)ئەچێتە ناوی، کەمی (مَکس)ی ئەکاو دەر ئەچێ، (یعنی)لە (وەقت)ی گیران؛ چونکی بە هیچ (وجە) (قمر) (مقابلە)ی (شمس)ی پێ ناکرێ لە (عبارەت)ی (قرآن)یش دا، (رعایەت)ی (مقابلە)ی (عبارەت)ی نەکرا؛ (حتّی) (ظاهراً) (قمر) (ذکر)ناکا؛ (مُفسّرین) (مُضطَرِب)ن، (أقوال)یان (مُختلفە)﴿وَكُلٌّ﴾ لە (شمس)و (قمر)؛ (ممکن)ە (شمول)ی بۆ (أرض)یش بێ ﴿فِي فَلَكٍ﴾ لە (مجری)یە، هەریەك لە (وضع)و (شرع)ی (طبیعی) (موقع)ەکی هەیە، (لایەق)ی (شأن)و (حال)ی خۆی وەکی (فلك)ی تەشی یو (دولاب)ی بیر﴿يَسْبَحُونَ﴾مەلە ئەکەن، بێ کەندو کۆسپە و خوارکە؛ بێ (تکلّف)ڕاست و ڕەوان، (حرکە)ئەکەن. ئاسمانی

(كُرى) (متوازى السطحين) (مركز)ى (مركز)ى (عالَم)؛ (قبول)ى (خرق)و (إلتئام)ناكا؛ له (نظر) (فلكيّون)ى نۆى (قديم)لەبەر (بعض)ێ (نظريات)تووشى (إشكالات)ئەبوون، به (أفلاك)ى (جزئيه)گوى يا (دفع) (إشكال)يتن ئەكرد؛ (لكن)گەلێ (إشكال)ماوه، بۆيان (حل)نەكرا، لەبەر ئەوە (مُجَدِّدين) (قسم)ى (أعظم)له (مسائل)ى (فلكيات)ى (إبطال)كرد؛ (فُسحه)يه (عجيب)يان دا به عالَم)ى (كَون)؛ كه (حقاً)ئەو ((سعەت)و (كثرەت)ە، له (سعەت)ى (علم)و (قدرەت)و (صانع)ى (حقيقى)ئەوەشێتەوه؛ (وعلما)يانى (نقل)و (حكايات)، دەميان له (فلكيّات)داوه، (رجماً بالغيب)قسەى نا (معقول)يان زۆر كرديه؛ بۆ (ترويج)ى (أوهام)و (مُزخرافات)يان؛ (حديث)ێ زۆريان رێك خستيه؛ وەكى (آلووسى) (نقّاد)ئەفەرمووێ: " (صحيح)له (أخبار)كەمه" وه (سيّد)ى (محترم) (إعتماد)لەسەر (روايات)ى (إماميّه)و (أكثر)ى (ما فى الهيئه)ى (سُنيّه)، نيه؛ (رەحمەت ى لێ بێ). خوا (جلال الدينى سيوطى) (عفو)كا، زۆر (خرافات)ى گرد كرديتەوه، بەناوى (حديث) (موجب)ى (إنكار)و (معاذ الله) (كفر)ى (أهل)ى (عرفان)ە؛ ئەوانەى كه ئاگايان له (مراتب)ى (أحاديث)نيه.

يەكى له (أعاظم)ى (رجال)ى (عثمانى)لەزەمانى (حرب)ى گەورەى هاته ئێره؛ (طلب)ى كردم؛ چوومه (زيارەت)ى. له (كيفيّەت)ى (تدريس)و چ (نوع)ە (علم)خوێندنى پرسى؛ (جواب)م دا؛ ئەز (جمله) (علم)ى (هيئەت)ئەخوێنن؛ ووتى: " كى هه (هيئەت)؟" ووتم:" (هيئەت)هەريەكە" ووتى: " نا، دووە" ووتم: " خێر، يەكە" ووتى:" جانم بەمنداڵى به ئێمه ئەڵێن:" (علم)ى (هيئەت)، دووە؛ يەكى( يۆنانى)، يەكى (إسلامى)" ووتم: (حاشا)وانيه؛ (هيئەت)ى (إسلامى)چيه؟" ووتى:" ئەوەى كه ئەڵێن: " (أرض)لەسەر شانى (ملائەكەت)ە، (ملائەكەت)لەسەر بەردە، بەرد لەسەر گاجووتە، گا جووت لەسەر ماسى يه" ووتم: " (سبحان الله)كێ ئەڵێ: " ئەمه (هيئەت)" ى (إسلامى)يه؟ (تأمين)ت ئەكەم، ئەو قسەيەله (بين)ى دوو لێوى پێغەبەرى،

دەرنەچووە؛ ئەو (خرافات)و (مزخرفات)ە (أغلب)لە (کعب)و (أمثال)یەتی؛ (إسرائیلیات)ە هێنایانە ناو (إسلامەت)ی" ڕووی کردە (قائم قام)ی (مرحوم) (أحمد حلمی)ووتی:" بە (شاهد)بە، (الآن)من لەسەر دەستی (فلان)ی (مسلمان)بووم؛ (والله) (قلباً)(إیمان)م نەبوو، چونکی وام ئەزانی، ئەو قسانە لە (طرف) (حضرەتی محمّد)ی یە؛ وە (معلوم)یشە وانیە، ئەمڕۆ (معلومات)ی (بشری)بوەیتە (عَیانی)" جا چەند هەزار (إنسان)ی وا بە بێ هوودەیی، لەدڵدا (مُؤمن)نەبوە؛ وە واش لە (دنیا)چوویتە دەر؛ تووشی (ملا) (نقّاد)نەبوون، (بیات) (حقائق)یان بۆ بکات. ئەو چەند (حقیقەت)ە تابڵێ (تفسیر)و (تحریر)هەڵ ئەگرێ؛ (حقاً) (حقّ)ە، بە (یس)ن بڵێن:" (قلب القرآن)ە" ﴿وَآيَةٌ لَّهُمْ﴾ ئەو (آیات)ە (خاص)نین، بە (أهل)ی (مکە)؛ بەس (عَود)ی (ضمیر)بۆ وان، لەبەر (خِطاب)ە﴿أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ﴾ (أولاد)یان، منداڵیان، (نسا)یان، ئەمە (إلتفات)ی (أنظار)ئەکا، بۆ (ضعف)ی (بشر)، تابزانن خوا لە چ (حاڵ)ێ، ئەیانگەیەنێتە چ (حاڵ)ێ بە چ (عقل)و (علم)و (صنع)ێ (تسخیر)ی (بحر)یان کردیە (حمل)ی ﴿فِي الْفُلْكِ﴾(یعنی)بە (فی) (فرق)ی هەیە، لەگەڵ (حمل)ی بە (علی)، هەم سوارن، هەم تێ یدانە ﴿الْمَشْحُونِ﴾(سفینە)ی پڕ (ذاتاً) ئەگەر (حمول) گران نەبێ وەکی (لانکی) بەسەر ئاوێ ئەم لام ئەو لای ئەکا (حرکە)ی (منتظم)ی نابێ (سفینة) وەکی (هلال)و ئەستێرە، لە (بحر)دا ئەڕوا، بە (سباحەت)دێ دەچی. (بشر)بەو (قوەت)و (علم)و (صُنع)ە، چۆن خۆی (ڕەزیل)ئەکا، بۆ (غیر)ی خوا، کوڕ نووش ئەبا؟ (عبادەت)ی (حیوانات)و (أجرام)ی (جامدە)یی بێ (قیمەت)و بێ جێ، بەجێ ئەگەیەنێ ﴿وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِ مَا يَرْكَبُونَ﴾ (تفسیر) بە (حوشتر)لام (مناسب)نیە (وکذا)بە (قطار)و (ئوتوموبیل)، چونکی (خَلَقنا)ئەفەرموێ: (أمّا) (تفسیر)بە (عَرَبە)زۆر جوانە، لە مێژە هەیە. (سوق)ی (عربە) (وَلَو)بە وولاغ، (أمّا) (سائق)ی وەکی (سائق)ی (فُلك) (بشر)ە؛ (حقاً)ئەمڕۆ (بشر)ی (مُخترع) (أعظم) (آیات)ی خوایە؛ لە

(سفینه)و کەڵەك گەیانیه(دونیوط)و (غواصة)لە (عجلة)گەیاندی بە (طیّار)ە.
ئەوانە هەرچەند (مصنوع)ی (بشر)ن، (أمّا)بە (إعتبار)ی (أساس) (مخلوق)ی
خوان (ومن العجائب) (تفسیر)ی (ذُرِّیَّة)بە (نُطفة)، وە (فُلك)بە (بطون)ی
(نساء) (ماوردی) (نقل)ی کردیه، وە (نسبه)ی بۆ (إمامی علی)دراوه (العیاذُ
باالله)ئەوە لە(بحر)ی (علوم)دووره؛ (لكن)ئەوەی ئەڵێ:" (إمام (مُبین))،
(علی)یە" ئەتوانی ژنیش بكاتە (فُلك)ە. وەلەگەڵ (آیەت)ی ﴿وَإِن نَّشَأْ
نُغْرِقْهُمْ﴾ لە ئاوێدا، رێك ناكەوێ ﴿فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ﴾ كەس بە هاواریان ناگا
(الصَّریخ = المُغیث)لام وایە دروستە بە (معنا) (صارِخ)بێ؛ بە (نوع)ێ ئەیان
خنكێنێ، هاواریان پێ ناكرێ. بەڵێ واش ئەبێ، زۆر هاواریان ئەكەن، بێ
هوودە ئەڕوا ﴿وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ﴾(نجات)نادرێن، بە (ملّاح)ان بەمەلەوانی ﴿إِلَّا
رَحْمَةً مِّنَّا﴾ ئەگەر (رحم)یانی پێ بكا، قورتاریان كا (غیر)ی خوا، فەردیان
رەس و (نجات)دەریان نیە﴿وَمَتَاعًا إِلَىٰ حِينٍ﴾ ئەگەر (أجل)یان نەهاتبێ،
(مُده)ی (معلوم)یان مابێ، پاشدان (مَوت) (حَتم)ە، ئەبێ بە (غرق)نا، بە
(حرق) (تعدَّدت الأ سبابُ والموتُ واحدٌ) (واقعاً)گەلێ كەس، لە (غرق) (نجات)ی
ئەبێ، بە (وجە)ێ (عجیب)و (غریب)؛ (شُبهە)نیە لە(وقایە)ی (إلهی)یە؛
(إستثنا) (مُتَّصِل)ە، (مُستثنی منهُ)چیە؟ یا (مُنقطعة)ە؟ یاخود (نصب)ەی بە
(نَزع)ی (خافض)ە، یا لەسەر (مصدریە)یە! ئەوجاوەرە كوردی تێ
بگات﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ﴾ (بعد تلاوة الآیات ولغت أنظارهم)﴿اتَّقُوا مَا بَيْنَ
أَيْدِيكُمْ﴾(عذاب)ی (دنیا)﴿وَمَا خَلْفَكُمْ﴾ (عقاب)ی (آخرەت)﴿ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾
(رجا)لە (طرف)وانە بالە (طرف) (قائل)ە، ئەوەی (نصیحەت)یان ئەكا.
(جواب)ی (إذا)لە (آیات)ی ﴿وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ آيَةٍ مِّنْ آيَاتِ رَبِّهِمْ﴾ هەرچی بێ ﴿إِلَّا
كَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ ئەفامرێتەوە؛ نەئەتوێنە (آیات)نەگوێ ئەدەنە، (داعی)و
(ناصح)؛ (أمّا)بۆ (دابَّةُ الأرض)آن، زۆر چاك گوێ ئەگرن ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا
مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ﴾لە (منافع)ی (برّی)و (بحری)بە (زراعەت)و (كسابەت)و

(تجارەت)بۆ تان ئەنێرێ ﴿قَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ئەوانەی پێ یان ئەوترێ ﴿لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ئەوانەی (أمر)یان ئەکەنی، نە (وجە)ی (نُصح)و (إرشاد)﴿أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَاءُ اللَّهُ أَطْعَمَهُ﴾وەکی ئێوە ئەڵێن:" (رزاق)هەر خوایە، (رزق)ی هەموو (حیوان)ئەدات؛ وەئەو (رزق)ی ئێمە خوا بەمەی داوە (معنا)ی چی، ئەیدا بە ئێمە، ناداتە ئەو (فقیر)و بێ نەوایانە؟ " ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ (جهل)ێ ئاشکرا؛ (مادام)خوا ئەو (رزق)ەی دایتە ئێمە؛ ئیمە بۆ بیدەین، بەخەڵکی؟ (فی الحقیقە)ئەو (إعتراض)ە دێتە سەر (أشاعر)آن؛ (لکن)بە (أسباب)ی (عادی)خۆیان (نجات)ئەدەن. (واقعاً)خوا (إرادە)بکات، (إحتیاج)ی کەس بەکەس نایەڵی، (أمّا) (نظم)ی (حیات)ی (دنیا)لەگەڵ ئەمە، ڕێك ناکەوێ. (أسباب)ی (معیشە) (تقسیم)کرایە؛ زۆر کەس لەبەر پیری، نەخۆشی، بێ (مناسبە)یی لەگەڵ (مسلك)ی، وەکی (ملایان)، بێ کارو (کسابەت)ئەمێنن، (دنیاً و وجداناً) (إیجاد)ئەکا، (مساعدە)ئەکا، (مساعدە)بکرێ؛ دیارە ئەو (قوم)ە (جاهل)و (بخیل)ن، نە (تحصیل)ی (علم)ئەکەن، نەکاری چاك زۆرم پێ ناخۆشە، کە (فقیر)ی (سؤال)ئەکات، پێ ئەڵێن:" خوابت داتێ" ئەگەرچی بە (وجە)ی (دُعا)ئەی لێن:" (سبحان الله)وا دەر ئەکەوێ (غیر)ی (إطعام)لە (إنفاق)، (حتی)بە (نفی)یش بە (دڵیان)دا نایە، باز (سبحان الله) ئەمڕۆش ئەوانەی (ناصح)ن، بە (عین)ی (کلام) (مقابلە)ئەکرێن! بەڵێ وایە، چارە لە (طرف)خودایە ﴿وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْوَعْدُ﴾ڕۆژی (قیام)ی (قیامەت)کە ئێمەی پێ ئەترسێنن ﴿إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾کەی ئەبێ؟ بابێ، بزانین چیە؟ چمان بەسەردی؟ (طبیعی)ئەمە لەڕوی (إستهزاء)و (إنکار)ئەی لێن. ئەگەر (دقّەت)لە (آیة)ی ﴿يَا وَيْلَنَا﴾بکەی، ئەزانی (ضِمناً) (إنکار)ی (قدرەت)ی خوا ئەکەن لەسەر (بعث)و (نشور)﴿مَا يَنظُرُونَ﴾(إنتظار)ی و چاوەنۆڕی ناکەن، لە هیچ شت ﴿إِلَّا صَيْحَةً﴾ (هائل)ێ (عظیم)﴿وَاحِدَةً﴾ ئەگەرچی (صحیة)بە گوێ ئەبیستری، (أمّا) (چون چەشم زورەهی داری بەری (الله أکبر)آست)چاو لەڕی

يەكى تيا هەيە ﴿تَأْخُذُهُمْ﴾ ئەيان گرێ، (إستيلا)يان بەسەرائەكات ﴿وَهُمْ يَخِصِّمُونَ﴾ لە (معملات)يان، يا (دائر)بە (أحوال)و (أهوال)و (إضطرابات)ێ (هائل)ئەوانە هەرچەند لێ ی (غافل)ن، (أمّا)لە (سؤال)و (إستعجال)يان، وەرئەگێرێ (أنّهُ) (إنتظار)ى ئەكەن، (مُتَرَقّب)ن﴿فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً﴾ ئەگەر لەناو (عائلە)بن؛ ئێستاش (مسلّمان)آن نۆ بێ (وصيّة)ئەرۆن ﴿وَلَا إِلَى أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ﴾ئەگەر لە (خارج)بن. ئەم (جواب)ە ئەگەرچى(جواب)ى (إستفهام)ى (أهل)ى (مكەيە)، (أمّا)ئەو(ماجرى)يە بۆ وان نەبوە، وەتا ئەمڕۆ كە (مُنتصب)ى (قرن)ى چواردەمين(هجرى)يە؛ نەهاتيتە (حَيِّز)ى (حصول)؛ خوا ئەزانێ كەى ئەبێ! ئەوانى (بالفعل)ئەى بينن، دێن، بۆ (أهل)ى (مكّە) (مُراد) (بيان)ى (سُهوليّەت)ى (قيامەت)ى (بعث)؛ هەر(آن)ێ خوا (إرادە)بكا، بە (صَيحَة)يە(عالَم)ئەمرێنى، بە (نَفخَة)يە زيندويان ئەكاتەوە!

﴿وَنُفِخَ﴾(أنّهُ)بوە؛ چونكى (نظر)بە (مابعد)ى (صيحە)يە ﴿فِي الصُّورِ﴾(أعرج) (صُور)دەخوێنێتەوە هەرچى هەيە، زيندى ئەبنەوە ﴿فَإِذَا هُم مِّنَ الْأَجْدَاثِ﴾ (قبور) (أجزا)ى (متفرّقة) (طبيعى)لە جێ يە خڕ ئەبێتەوە؛ ئەو (مكان)ە بە (قبر)ى خۆى ئەزانێ. وە بۆ ئەوانەى لەو (وەقت)ى بە (إجتماع)ئەمرن، (قبر)نابێ؛ كێ (قبر)يان بۆ هەل ئەكەنێ؟(رُبَّ لَحْدٍ صارَ لَحْداً مِراراً ضاحِكٌ مِنْ تَزاحُمِ الأضدادِ) (خلاصە)لەو (مَحلّ)ى (أجزا)يان كۆ ئەكرێتەوە، هەلّ ئەڕژێنە (ميدان)ى (عرصات) ﴿إِلَى رَبِّهِمْ﴾ (الحقيقىّ)﴿يَنسِلُونَ﴾ بە (سيعى)ئەرۆن ﴿قَالُوا﴾(حين البعث)﴿مَن بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا﴾ (لازم)نيە، (مرقد)بوە ناوى (قبر)ى، ئەوى تيايەتى لە (حال)ى (رقود)بێ؛ (عذاب)نەبينێ، وە هەم (إشارەت)ە، بۆ (سهولەت)ى (بعث)، (كأنّهُ)لەخەو بە (خبر)هاتينە (عذاب)ى (قبر)ى بابيى، (أمّا) (لازم)نيە، تا (أبد) (يعنى)تا(بعث) (دوام)كات. (إنسان)نازانێ بڵێ: " چى؟ (لينين)ئەوا چەند ساڵە، لەناو (مرقد)ى (مينا)خەتوە چ (أثر)ى (عذاب)ى تيا ديار نيە؛ ئەگەر گورزى (ملائكەت)ەكانى

پێ کەوتبا، (طبیعی) (قەبر)ە (مینا)یەکەی خردو خاشاك ئەبوو؛ (هیکل)ی (فراعن)آن، چەند هەزار ساڵ بوو، لەناو (أهرام)ان دان، بە مۆمیا کراوی مابوون، لە باڵ یەکیش نەهاتبوونە دەر، دیارە (عذاب)ی (قبر)شتێ ترە، وەکی (عذاب)ی (حِسّی) (دنیا)نیە، (أثر)ی لە (بَدن)دا، (ظاهر)بێ؛ هەرچی هەیە، خوا بمان پارێزێ. (سؤال)لە (بعث)ناکەن، زێرا (مشهور)ە ﴿هَذَا مَا وَعَدَ الـرَّحْمَنُ﴾ دیارە، (إحیا)ش وەکی (أصل)ی (إیجاد)لە (أثر)ی (رەحمەت)ە﴿وَصَدَقَ الْمُرْسَلُونَ﴾ (إنسان) (یعنی)ئێە (إیمان)مان بە (وعد)ی خواو (صدق)ی (رسول)آن هەیە؛ (أمّا)بە (طول)و (تفصیل)ی (قصّاص)آن، نا. هەرچەند (شێخ)ی (إبن عربی)ئەو (أحوالات)ە، بە (طور)ێ (وراء طورِ العقول) (حساب)ئەکات، (أمّا) (وافق)ئەمەتە؛ وکی (شێخ محمد عبده) (إختیار)ی فەرمووە: (مُجملاً) (إیمان)مان پێ ی ببی؛ (تفصیل) (موکول)ی (علم)ی خوایە؛ کە (أحوالات)ی (برزَخ)و (قیامەت)ی لە (مُتشابهات)ی (عَد)فەرمووە: ﴿إِن كَانَتْ﴾(نفخه)﴿إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً﴾ یەك دەنگی، لە چیەوە؟ بەڕاستی خوا ئەی زانێ! (ممكن) وەکی بانگی(إبراهیم)بێ، لە خوا بانگی بە (غلبە)، لە (أنام) (إیجابە)یە، سووك و آسان ﴿فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ﴾ هەموویان - بێ (تأخیر)و (توقّف). (سیّدی آلوسی)ش ئەفەموێ: (وَفیهِ مِنْ تهوینِ أمر البعث والحشرِ والإیذان. باستغنائها عن الأسباب، ولایخفی)وایە پەك لەسەر (إسرافیل)و (عزائیل)یش نەکەوتوە ﴿فَالْيَوْمَ﴾ کەتیای (حاضر)ئەبن ﴿لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ﴾(مؤمن)و (كافر)، (بر)و (فاجر)﴿ شَيْئًا﴾ (مِنْ الظُلْمِ)یا هیچ (ظلم)یان لێ ناکرێ﴿وَلَا تُجْزَوْنَ﴾ بە (خطاب)ی (عام)﴿إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (إن خیراً فخیراً، وإن شراً فشّراً) (ثمرة)ی (أعمال)یش، (طبیعی)لە (أعمال)ە؛ (حتّی) (زێدە) (فضل) بەسایەی (إعمال)ی (فاضلة) وەیە (ممکن) (خطاب)بێ، لەگەڵ (مُنکر)آن (والله أعلم)لام وایە، ئەو (وجە)ە (أنسب)ە، لەگەڵ (آیة)ی ﴿إِنَّ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ الْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فَاكِهُونَ﴾ ئاگایان لەو (أهوال)ە، نیە؛ (بناءاً

علیه)با (نفس)یش به (نفس)ی وان (تفسیر)بکریّ؛ (تقدیر)و (بیان)ناکریّ چ خۆشیەکە تیان، وە (مشغول)ی کردینە، لە (أهوال)و (مَهوال). یاران لە جیّ ی خورەم و دلگوشادانیش، (سعة)یّ خۆش بکەن، زۆر خۆشە (قرآن) (إلتفات)ناکا، بۆ (إقتضاض)ی (أبکَار)بنۆریّ چەند (عالی)یە، ئەفەرمووی:" ﴿هُمْ وَأَزْوَاجُهُمْ﴾ ئی (دنیا)یە؛ بائی (فردوس)یش لەگەلّ بیّ ﴿فِي ظِلَالٍ﴾ سیّبەر ﴿عَلَى الْأَرَائِكِ﴾ (سریر)، تەخت و قەنەفە ﴿مُتَّكِئُونَ﴾ پالّیان داوەتەوە؛ ئەو (ظِلّ)ە (ظِلّ)ی (شمس)نیە، هەر (خالد)ە ئەبیّ بەهەشت (نور)و سیّبەری تیا هەبیّ؟ ئەگەر بە(معنا) (عِزّەت)و (مناعەت)و (وقایە)بیّ، زۆر جوانە؛ چونکی ئەو (مُجرم)آنە، (مُسلمان)ەکانیان لا زۆر بیّ (حرمەت)و (عِزەت)بوون، تا (إسلام) (قوەت)ی ساند کەس نەبوو، بچنە ژێر سیّبەری؛ ئەمرۆ لەژێر سایەی (إلهی)ن، (مُکرّم)و (مُحتَرم)؛ دوشمنانیان، (مُحقَر)و (مُهان)﴿لَهُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ﴾ دیارە خواردنی (أهل)ی (جِنان)، بۆ (دفع)ی (ألَم)ی (جوع)و (دوام)ی (حیات)ی (شخصی) نیە بۆ (تلذوذ) (تفکهە) (حتّی)گۆشتی (طیر)یش ﴿وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ﴾ ئەوەی (طلب)ی کەن دیارە (أهل)ی (جنّة)ئەوەی (لایەق)ی (شرف)ی (روح)ی (بشر)ی بیّ، داوی ئەکات؛ وە (أعظم)ی (مآرب)یان ﴿سَلَامٌ قَوْلًا﴾ فەرموودەیە﴿مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ﴾ لەو (حال)ە، خوا (بِالذّات) (سلام)یان لیّ ئەکا؛ ئەوە (سلام)ی (ملائکەت)آن نیە؛ وەئەو (سلام)و (سلامەتی) (أبدی)لەم (سورەت)ە، (رابط)ی ئەو (سلام)آنتیە، کە لە (سورەت)ی (تالی)دادیّ ﴿وَامْتَازُوا الْيَوْمَ أَيُّهَا الْمُجْرِمُونَ﴾ بە گویّرەی (إمتیازی)تان، لە (مملکەت)ی (آثام)و (جرائم)هەریەك بە گویّرەی، (زیّدە)یی، (إمامەتی)وە (زەعامەت)ی خۆی، (إمتیان)وەرئەگری. (أمّا) (إمتیان)یان لەگەلّ (أهل)ی (جنّة)لام جوانیە، تیّکەلاّو نەبووین، تا لیّك (إمتیان)بدریّن؛ (ممکن)ە ئەو فەرمایشە لە (عرصات)دا لەگەلّ (مُجرم)آن بکریّ، کی (أصحاب)ی (جنة)لە (شُغل)یّ (عظیم)دابووین؛ لە (ترکیب)ی (آیة)ی (سَلامٌ)وە (عطف)ی ئەم (آیة)ە، قسەیان زۆرە ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ

﴿إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ﴾ لە (دار)ی (دنیا)، بە (عنوان)ی (بنی آدم)یان (خطاب)لەگەڵ ئەكا؛ زێڕا (عهد)ەكە (قَبل المُجرمین)بوە (خطاب)و (أحكام)ی (قرآنی) (نظر)بە (مِصداق)ی (عنوان)و (أحكام)ی (قرآنی) (نظر)بە (مِصداق)ی (عنوان)ی (قضية)ئەكا؛ (سبحان الله)ئەوەی (شیطان)ی (رجیم)ئەكا، ئیش (خراپ)و (خسیس)ی لێ دەبینێ، (صادر)ئەبێ؛ (راضی)نیە، (نسبت)ی بە خۆی بدا، ئەڵێ: " ئیشی (شیطان)ی یە ! " ئەوەندەیان (شیطان)لا (رەزیل)و (دنی)یە ئەو (عهد)ە (عهد)ی (عقل)و (فكر)و (دلیل)و (برهان)ە؛ (عهد)ێ (فطری)یە؛ (عهد)تان وابوو ﴿أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ﴾ (عبادەت)ی (غیر)خوای، (عبادەت)ی (شیطان)ە؛ ئارەزوو (مَیل)ی ئەو (خبیث)ەئەوەتە: (إنسان) (عبادەت)خوای ئەكا، (عبادەت)ی هەرچی ئەكا، بی كا؛ (حتّی)سەگ و پشیلە و (جماد)﴿إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ (عداوەت)ی ئاشكرایە. ئەزانن ئەوی (خراپە)یە، (نسبة)ی بۆ ئەوی ئەدرێ ﴿وَأَنْ اعْبُدُونِي﴾ (عبادەت)ی من بكەن﴿هَذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ئەڕێ ڕاستە، (إنسان)و ئەگەیەنێتە (مقصد)﴿وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا﴾ (أقوام)و (أمم)ێ زۆر (حتّی)خۆی ئەگۆڕێ لە (بعض)ەكان بەناوی (ملك)ی (طاوس) (عبادەت)ئەكرێ. لە (بعض)ێ (مُجلّە)ی (مصری)م دادی یە؛ (داسنی)وولاتی ئێمە (إبلیس)بە (إلە)ی (أرض)ئەزانن؛ ئەڵێن:" خوا زۆر خەریك بوو، بۆ (إصلاح)ی (بشر)بۆی (مُیَسَّر)نە بوو، چۆوە ئاسمانان، (زمام)ی (إدارە)ی (أرضی)دایە (إبلیس)لام وایە، ئەڵێن: " تا دەهەزار ساڵ.

" (لطيفة)، بۆ كەیێ هەیە بڵێ:" (إبلیس)یش (زمام)ی (إدارە)ی (تدلیس)و (تبلیس)و (سیاسەت)ی (حیلە)كاری بوو (فتنه)ئەنگێزی دایتە، (سیاسیّون)ی (إنگلیز)ی، لەگەڵ (جهەت) (شیطان)یان حەساندیتەوە" (حقاً)ئەمڕۆ (إبلیس)كاری خۆی لە (بشر)دیت، ئازەرووی (تَمام)هاتە جێ! ﴿أَفَلَمْ تَكُونُوا تَعْقِلُونَ﴾(تفكرّ)ی بكەن، مصالح و (مفاسد)لێك كەنەوە (حقیقة)چاكەو خراپە، (عقل)و (وجدان)ی پاكی (بشر)ی (فرق)یان ئەكا؛ هیچ نەبێ وەكی گاوان

ئەزانێ (إنسان)لە گا گەورەتر؛ گا (مُسَخَّر)ە، بۆ (بشر)، (مع هذا)ش ئەی پەرستی. بەڵێ لەبەر (إختلاف)ی (سیاسەت)و (میول) (عقل)لێ ی شێواوە؛ (حتّی) (مع الأسف) (بعد إرسال الرسل)یش (أسباب)ی (تشویش)کەم نەبوو، بەڵکوو (رؤسا)ی (أدیان) (زیاد)یان کرد؛ (حتّی) (جمع)ێ قوڕیان بەدەمی (عقل)دادا؛ نابێ چ بڵێ؛ (تسلیم)و (مُنقاد). هەرچەند (عقل)ڕێ بە (تفصیلات)ی (یوم)ی (جزا)نابا، (أمّا)ئەزانی، (مجازات)و (مکافات)هەی، بۆ (أعلام)ی بوونی (یوم)ی (جزا)، (رُسل)ی (عظام)ناردراون ﴿هَذِهِ جَهَنَّمُ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ (علی السنه الرُسل) (فإذا)بۆ (کفر)و (ضَلال)چ (عُذر)تان نیە﴿اصْلَوْهَا الْيَوْمَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ (صَلا) (ئەبو مسلم)بە (وقود)؛ (طبری)یە (لزوم) (تفسیر)ئەکەن؛ (کذا) (فی الروح المعانی)﴿الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ﴾(بعد الانکار) (حسب العاده)ناتوانن قسان بکەن (وَلَوْ)زوبانیان هەیە؛ سەریەخۆ بێنە گفتار﴿وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ (کلام)و (شهادەت)ێ (قالی)، دوور نیە؛ لەپاش (غرامەفۆن)و (رادیۆ)و (سینما)ی (ناطقة)، (تصدیق)و (إیمان)بەقسەکردنی (أعضاء)، (سهَل)ە. قسەکردنی (مع الخطاب)بۆ دەست (شهادەت)بۆ (أرجل)بۆ؟ (إمام)شتێ ئەفەرمێ؛ چاکم نەهاتە بەر (طبع)؛ (ممکن)ە بڵێن: " (أعمال)ی (یَد)ی (وَلَوْ)بە ریش بێ، (أکثر)ی مەردایەتیەکی تیا هەیە؛ (لکن) (أعمال)ی لای خوارێ (خصوص)ئی (عموم)ی (عوام)، (مُستهجن)و (چڵکن)؛ ئێوەی نیە بە (توجیه)ی (خطاب)بۆ (حضرەت)ی (کبریائی) (إبراز)بکرێن"؛ وە (قسم)ێ ئەفەرموون: " (کلام)و (شهادەت)ی (حالی)یە؛ لەسەر (أعضا)یان (علامەت)ێ وادەرئەکەوێ، کە (معلوم)ببێ، چێ کردیە" (يُعرفُ المجرمونَ بِسيماهمْ فَيُؤخَذوا بِالنَّواصي والأقدم) (الآیة)ە؛ (أمّا) (إمام) (لطیفة)یە خۆش وئەفەرمووێ: ئەوانە لە (دنیا)دڵیان مۆری لێ دراوە (يَقولونَ بِأفواههم ماليسَ في قلوبهم)لە (قیامەت)زوبانیان مۆر ئەکرێ، بۆ قسە کردن، (باقی)

(أعضاء)ئەمێنێتەوە." (أبو موسی الأشعری) (علی وجه الحُسبان)؛ (حَسَن)بە (جَزم)وئەفەرموون:" (أوّل) (أعضا)ی بەقسە دێ؛ ڕانی ڕاستی یە" ئەمە (سِرّ)ی چیە؟ ئەبێ (إشعار)ی تیا بێ، بۆ (مُقدمات)ی (زِنا)و (إستمناء)؟؛ خوا خۆی ئەزانی؛ ئێمە (إیمان)مان هەیە، بە (منطوق)ی (قران)؛ (عِلم)بە (تفاصیل) (عائد)ی (حضرەت)ی (کبریائی)یە ﴿وَلَوْ نَشَاء لَطَمَسْنَا عَلَى أَعْيُنِهِمْ﴾ چاویان کوێر کەین؛ بێ (أثر)ی (موقع)؛ لووس و پووس؛ ئەوانە چن؟ خۆیان هەندە لەکن خۆیان هەیە؛ وائەزانن، بێ لە (قیامەت)، لە (دنیا)خوا ناتانی، بە (أنواع)ی (عذاب)گرفتاریان کا؟ هەر (آن)ی (حظ)کا کوێریان ئەکا. ﴿فَاسْتَبَقُوا الصِّرَاطَ﴾ پەلە کوتە ئەکەن گۆی یا پێش کەوت﴿فَأَنَّى يُبْصِرُونَ﴾ چۆن ئەبینن؟ ڕێ دەرئەکەن(العیاذ بالله) (إنسان)بە گەورەیی کوێر بێ چی پێ ناکرێ؛ بەڕێی (جادە)و (مألوف)دا، ناتوانی بڕوا؛ (أمّا)ئەوانەی بە منداڵی کوێر دەبن، زۆر زرنگن؛ (عجایب)ئەڕۆن (حتّی) (بعض)ەکیان دار بە دەستەوە ناگرین ﴿وَلَوْ نَشَاء لَمَسَخْنَاهُمْ﴾ (سورەت)یان ئەگۆڕین؛ وەکی ورچ و بەراز و (میمون)یان لێ ئەکەین.

(شخصی)کم دی ڕووی زۆر بە ورچ ئەچوو، (خصوص)لێو و چەنەگە و کەپووی؛ (حتّی)بۆ (مُبالغە)ئەیان ووت: "ئەوە لە ورچە، داکی لە ورچی گرتوە، لەچیای لای (مەرگە)" ﴿عَلَى مَكَانَتِهِمْ﴾ لە جێی خۆیان؛ یاخود (إفلیج)یان ئەکەین ﴿فَمَا اسْتَطَاعُوا مُضِيًّا﴾ بۆ (طرف)ی (مقصود)یان ﴿وَلَا يَرْجِعُونَ﴾ چوون هاتنیان پێ ناکرێ وەك کۆلکەدار لە جێی خۆیان ئەمێنن ﴿وَمَنْ نُعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِي الْخَلْقِ﴾ هیچ نەبێ، بنۆڕنە (أطوار)ی (بشر)ی، لە (حال)ی جەوانی، هەرچەند بە (قوەت)و چاپووك و چالاك و چوست بێ، کەپیر بوو چی لێ دێ؟ بێ هێزو کوڕو ئەبێتەوە؛ کەڕ ئەبێ، چاوی (رِمل)ئەکا، تروسکەکی ئەمێنی، ئەڕوا بە لۆنگە لۆنگ ﴿أَفَلَا يَعْقِلُونَ﴾ کەسێ (آخر)ی واوەرگەڕێ، بە(زمان)ی (شباب)و (قوەت)ی نابێ (مغروور)بێ،

(خاصه)دەربارەیی(حضرەتی قادر)و (قوّی)ی (مطلق)﴿وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ﴾ لـه (صدر)ی (سورەت)، (جنابی حق)به (تأكید)فەرمووی:" تۆ لـه پێغەمبـەرانی"، پێغەمبـەرنابێ (شـاعر)و (خیـال)ی (شـاعران)ەی هـەبێ، باسـی (رُسُـل)لـه (حكمـات)و (حقـائق)ە، لـه دوای (خیـال)ی بـێ هـوودەدا، نـاڕۆن؛ ئـەوانی لـه (أیّـام)ی (قـوەت)و جـەوانی(مغـرور)ئـەبن - (نوعاما) (شـاعر)ن، ئاگایـان لـه (شـاعر)ی خۆیـان نیـه، ئەگـەربمێنن، چـیان لێ دێ؟! (تـزیین)و (تقبـیح)ی (رسـول)آن (حقیقـه)ە، بـه (زخـاف)خـەڵكی فریتـه ناكـەن، بـەڵێ (تـزیین)و (تشویه)ی (شـیطان)و (شاعر)آن، (خـلاف)ی (حـق)و (حقیقة)ە، لاف گەزافـه ﴿وَمَا يَنبَغِي لَهُ﴾لێ ی ناوه شـێتەوە، (لایـەق)ی (شـأن)ی (محمـد الأمـین)نیـه؛ (شاعر)ی و (میل)و (مزاج)ی (رسالەت پەناه)، لێك دوورن؛ (أشـراف)زادەكـان نابن به (شاعر)مەگەر (خِسّة)ی (طبع)یـان ببـێ؛ (هجـو)و (مـدح)ی خـەڵكی بـه ژنـان و (أمـراد)آن هـەڵ گـوتن، (لایـەق)ی (طبـع)ی (عـالی)نیـه؛ (إغـرا)لـه (عالی)نەژادان نایه؛ بەڵێ(ممكن)ە (بعض)ی (ذوات)ی گەورە، چـەند (مـواعظ)و (نصائح)و (حكیمات)باوێته (قالـب)ی (مـنظم)و (عبـارەت)ێ خـۆش و (نـازك)و (لطیـف)، (أمّـا)ئـەو كەسـه شـاعر نیـه؛ (نـاظم)ی (دُرّ) (نَسّـاج)ی (خیـوط)ی (ذهـب)ی و (حریـری)یـه زۆر وادە یـی، لـه (أثنـا)ی قسـان (عبـارەت)ێ (منظـوم)بەسـەر زوبـانی (إنسـان)ی دا (جـاری)ئـەبێ، (حتّـی)لـه (مَقولـه)ی (كُتّاب)آنیش زۆره وه (قائل)ە؛ نەتوانی (شعر)بخوێنێتەوە؛ (یعنـی) (إنشـاد)ی بفەرموێ؛ (ولَوْ)كەوا (نقل)كراوە: ئەگەر (إنشاد)ی (شعر)ی كردبـێ، بـه لـەنگی خویندیتیەوە، (طبعاً لاقصداً)كه (رسـول)ی (أكـرم) (شـاعر)نـەبێ، (قـرآن)یـش (شعر)نیه ﴿إِنْ هُوَ﴾(قرآن)﴿إِلَّا ذِكْرٌ﴾ (مَواعظـة)و (إرشـاد)ە ﴿وَقُـرْآنٌ مُّـبِينٌ﴾ ئاشكرایه، (واضح)و (بلیغ)و (فصیح)ە ﴿لِيُنذِرَ﴾ (قرآن)یان (رسول)﴿مَن كَانَ حَيًّا﴾ به (حیات)ێ (عقل)و (عمل)ی و (محقق) ئەوەی (أدنا) (حیات)ەكـی تیـا مابێ، به (واسطة)ی (قرآن)شینِ ئـەبێ، (نمـا)ئـەكا، (قـوەت)ئەسـتێنێ﴿وَيَحِقَّ

الْقَـوْلُ﴾ ﴿ سَـوَاءٌ عَلَـيْهِمْ أأنـذَرْتَهُمْ أَمْ لَـمْ تُنـذِرْهُمْ لاَ يُؤْمِنُـونَ﴾ یـا (كلمـه)ی (عذاب)﴿عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ (عريق)ی (فى الكفر)، (بحَيْـثُ) (قـوەت)ی (حیـات)یـان تیانەماوە، بوینە مردی، (جامد)﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا﴾ ئەگەر (حیـات)یـان هـەبا(قـوا)ی (حسيّة)یان ئەبوو، کە (حیات)نەما، (حس)چۆن ئەمێنێ؟ (آية)یان دیوە؟ ﴿أَنَّا خَلَقْنَا لَهُمْ﴾ بـۆ (نفـع)ی وان (بشـر)ێ ﴿مِمَّـا عَمِلَـتْ أَيْـدِينَا﴾هەرچـی تەماشـای بکـەی، لـە (مصـنوعات)ئـەلّێ ی:" بـە (کمـال)ی (علـم)و (قـدرەت)و (قـوەت) (خلق)کراوە" وە (معلوم)ە ئەو (حیوانات)ە، لە (خلق)و (إيجاد)دا، (مُداخلـە)ی کەسی بەسەرەوە نیە؛ (سمًا)بوتەکان، (محض)بە (خلق)ی خوایە؛ دەسـت بـە (معنا) (عُضو)نیە؛ (مجبوراً)ئـەبێ (معنـا)یـە (صـحيح)و موافـق)ی (مقـام)ی لێ بدرێتەوە؛ (سَلَفی)ئـەلّێن:" چـی؟ " دیـارە (خلـق)ی (حیوانـات)لـە (رەحـم)ی دایکیـان دان؛ بـەچ (وضـع)و (ترتیـب)و (قـوّة)ئـەکرێ؟! (عُلمـا)ی (رەحـم) (عجاییـات)یـان دەرخسـتوە، ئـەو تـارو پـوورە، ئـیش دەسـتی بـە (معنـا) (عضوة)نیە؛ (ذاتـاً)دەسـتیش ئەگـەر(قـوەت)ی تیـا نـەبێ، وەلـە ژێـر (علـم)دا (إدارە)نەکرێ چ نیە. وەئەگـەر (مُلاحظة)ی (غلَـب)و (قهـر)ی (کبریـائی)کـەی، ئەلّێ ی:" بە (لفظ)ێ؛ (یعنی) (أمر)ی (كُن) (إيجاد)کراوە" (دقة)لـە (مواقـع)ی (قرآن)کە، (مقابل)ی (شیطان)کە (سجدە)ی بۆ (آدەم)نەبرد( مالَك لا تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْـتُ بِيَـدَيَّ)﴿ مَثَلُـهُ كَمَثَـلِ آدَمَ خَلَقَـهُ مِـن تُـرَابٍ ثُـمَّ قَـالَ لَـهُ كُـن فَيَكُـونُ﴾ (إظهار)ئەکا؛ لێرە بۆ (بیان)و (إفساح)ی (آیات)و (دقائق)ێکـە، کەلـە (صُـنع)ی (أنعام)دایە (أيدينا)ئەفەرمووێ. ئـەوەی ووتیتـی:" خـوا (آدەم)و (فـردەوس)ی بە دەستی خـۆی (خلـق)کردیـە؛ (بـاقی)بـە (أمـر)ی (كُنْ)زۆر (غافـل)بـوە، لـە (قرآن) (فضل)لە (أسرار)ی خوای (تعالی)ن؛ بە (کمال)ی (قُدرەت)ی (صانع)ی خۆی بۆئەوانەی ﴿أَنْعَامًا﴾ لەڕووی (إنعام)ەوە (خلق)کردیە. ئـەو (حیوانـات)ی (عظیم)و (قوی)بۆیان (تسخیر)بوە؛ تەماشای گـامێش کـە شـێر بەسـەر قۆچـی خۆیەوە ئەکا، کەیاخی بوو (عالَم)ئەخاتە لەرزە لەرز، لـە دوورەوە ئـەی بینـی،

لێ ی ئەتۆقێ؛ حوشتر بۆ (بلاد)ی (رمل)ستان، چی (إنعام)ێ (عظیم)ە؛ (خیرات)ی مەڕو بزن، نایەتە (حساب)﴿فَهُمْ لَهَا﴾ بۆ (أنعام)﴿مَالِكُونَ﴾ئەو (أنعام)ە بوویتە (مال)و (مُلك)بۆ ئەوان ﴿وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ﴾ نەرم مان كردوون، بۆ وان﴿فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ﴾ (مركوب)ە ﴿وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ﴾ گۆشتیان ئەخۆن ﴿وَلَهُمْ فِيهَا﴾ (بِقسميها)﴿مَنَافِعُ﴾(أوبار)و (أشعار)و (أوصاف)و جووت و (حراثة)؛ (حتّى)ڕیخۆڵەكەیان بە (خسار)ناچێ؛ بەڵكو لەو چەندانە، (تجارەت)ێ (عظیم)و (نفع)ێ زۆری هەبوو؛ ڕیخۆڵەكەی (حیوانات)ی (كۆیە)، ئەچوە (أمریقا)﴿وَمَشَارِبُ﴾ شیرو ماست و دۆ؛ ئەو (تقلّبات)ی (كیمیاوی)كەبەسەر شیردادی، هەزار ئافەرینی خودا، لە (مُخترِع)آنی (بشر) (حقاً) (أسرار)ی (بلاغەت)ی (كائنات)، (إستعداد)ی دوورو نێزیكی، بێ (تعقید) (بیان)ئەكەن؛ (حقاً) (عُلما)ی (بیان)ئەوانن؛ (بیان)ی (لفظی)ئەگەر (بیان)ی (عملی)لەگەڵ نەبێ، (مع الأسف)بێ هوودە ئەڕوا ﴿أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾ ئی وەی ئەوانەی بۆ (خلق)كردینە﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً﴾(أمّا)چ (إلهە)ە؟ پێشكە ومێش، لە (فوق)ی وانن! (إتخاذ)یان كردینە ﴿لَعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ﴾لە (طرف)وان؛ ڕووی خۆیان بۆیان، لەسەر خاكی دادەنێن؛ (دُعا)ی (نصرەت)یان (عرض)ئەكەن ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ﴾ (جامد)و (حیوان)ی بەستە زمانو (نصرەت)؟ ﴿وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ﴾ (حاضر)و آمادەن، بۆ (محافظة)یان؛ هەرچەند ئەوانە (مُحضر)ئەبن، بۆ (دخول)ی (نار)، (أمّا)لێرە (فهم)ناكرێ، بلێن:" (معنا)ی (آیة)، ئەوانەی لەشكرن بۆ (الهە)یان لە (دنیا)یە، (حاضرن)بۆچوونە ناو ئاگر لە (قیامەت)ێ" (واقعاً)وایە، (أمّا)وەكی (عرض)كرا، لە (عبارەت) (فهم)ناكرێ﴿فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ﴾ (مادام)ئەوانە، هەندە بێ هۆش و گۆش بن، (تفكّر)ێ لە (حال)ی خۆیان و (حیوانات)و (الهە)یان نەكەن، باقسەی وان، تۆ (محزون)نەكا؛ (أهمیەت)مەدە، گوفتری ناهەمواریان ئەوە (شاعر)و (ساحر)ە، (ومعاذ الله) (مجنون)ە﴿إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ (علم)بە (أسرار)

(أهَم)ە، (مع أنّهُ)وەكی ئەفەرموون:" (سِرّ) (مُقَدَّم)ە، له (عَلَنْ)" (أوّلاً)له دلّدا، شتێ (تصوّر)وئەكەی، بیكەی؛ (بَعدَهُ)ئەی كەی خوا(قبل التصور)یش ئەزانێ، چ ئەكەی؟ وەچ ئەكەی؟ (جناب)ی (عالِم الأسرار) (جزا)ی گوفتاری ئەو (كُفّار)آنە ئەدات ﴿أوَلَمْ يَرَ الْإنسَانُ﴾ (حقّاً) (إنسان)خۆی (أتمّ)و (أعظم)ی (دليل)ە، لەسەر (وجود)ی (صانع)ی (قدير)ی (علّام). (تأمل)یان له (خلق)ی خۆیان، نەكردیه؟ نەیانزانیه؟ ﴿أنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ﴾ ئەزانن، (نطفة)چیه؟ (ولَو)نەزانن، (عناصر)ی چیه؟ ﴿فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ﴾(جدلی)﴿مُّبِينٌ﴾ (ظاهر الخصام)، (مقصد)ی (إظهار)ی (حق)نیه ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا﴾ (دائر)به (شأن)ی (إلهی)، (إراد)ی (قصّه)یه (عجيب)ئەكات﴿وَنَسِيَ خَلْقَهُ﴾ لەبیری چوویتەوە. گەلێ هەن، (خيال)ی لێ ناكەن چی ئەلێن؟ ﴿قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ﴾ هێسك ﴿وَهِيَ رَمِيمٌ﴾ ڕزی؛ كێ هێسك ڕزی زیندی ئەكاتەوە؟ ئەو گۆشت و پێست و جەرگ و دڵ سیپەلاك و (سائر)ی (أجزا)ی دی، هیچ ﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ (لاشك) (عظم) (حيات)ی تیایە؛ وەكی (لحم)و دەمارو ڕەگ، وە (ألم)ی (عظم)له (ألَم)ی (أجزا)ی تر ناخۆشترە؛ (أمّا) (عظم)ی (مَيتة)ی پیسە، پاكە؟ (مسئله)یە (إجتهادی)یە، (عائد)ی (فُقها)یانە؛ بەلێ (بعض)ە (أجزا)یە (حيوانی)، (حيات)ی تیانیە، (دَرك)ی (ألَمْ)ناكا، ببڕێتەوە، وەكی نینۆك؛ سەرەسمی وولاغی وەسەرە شاخی، (أمّا)ناوی (درك)ی نەكا ﴿وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ﴾ (مَخلُوق)﴿عَلِيمٌ﴾ (صيغه)ی (مبالغه)یە، ئەگەرچی بۆ خوا (مُبالغه)نیە؛ هیچ شتێ لێ گوم نابێ ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُم﴾ (أيّها الإنسان)﴿مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا﴾ ئەگەر (قوم)ی ڕابردوو بیانزانیبا، ئاو له دوو (مادّە)یی (ناریه) (مخلوق)ە ئەیانزانی، (قسم)ی (أعظم)له دار، له (مواد)ی (ناريه) (إحتياج)ی بە (زَند)و مەند نیە﴿فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ﴾ ئەوە (عَيان)ە. ئەلێن: " (إبن عباس)فەرموویەتی: " له هەموو دارێ، ئاگر هەیە؛ (إلّا)داری (عنّاب)نەبێ" باوەڕمەكە؛ ئومێدە (نقل)ەكە، ئی خۆی نەبێ. بەلێ (بعض)ە دار، (مواد)ی

(إحتراق)ی زۆر ترە له (بعض)ی ﴿أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ (بما فيهما من بدائع الصّنع)كە (عقل)ی (سرامد)آنی (حكمت)، لە (أدنى) (مەجود)ی (حَيران)ە. ئایا ئەوەی (خلق)ی ئاسمان و (أرض)ی کردیە (ليس)﴿بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُم﴾ بە (إعادە)یاخود، ئەوانە (مادام) (إنكارى)ی (قدرەت)ی خوا بکەن، لەسەر (إعادە)؛ (إنكار)ی (قدرەت)ی خوا ئەکەن، لەسەر (أصل)ی (إيجاد)یان. (نبذة)یی (بعدە)لە (إعادە)یی (أجسام) (عرض)ئەکرێ ﴿بَلَى﴾ئەتوانێ، لای زۆر ئاسانە ﴿وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ﴾ ئەگەر (مخلوق)ی (جاهل)نەتوانی (تصوّر)ی بکا، (خلاف)ی (عليم)ئەتوانێ (تصوير)ی بکا؛ ئێمە کە ئاگامان لە (قواعد)ی (صُنع)نیە، زۆر شتمان (إنكار)ئەکرد، کەچی (مُخترع)ەکان هێنایانە جێ؛ (حتّى) (بعض)ە (قواعد)ی (سماع) (علاّمە)یە وەکی (سعدی أكبر) (إنكار)ی ئەفەرموو، لەسەر ئەو (قواعد)ە، (تلفون)و (راديۆ) (إختراع)کرا ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ﴾ (شأنُهُ، قولُهُ) (خاصّ)ی ئەوە، کەسیتر (شرکەت)ی لە (شأن)ی (صانع)ی وی، نیە (وَلى) نە(نبى)نە (مَلَك)نە (روح)بۆیان (ممكن)نیە (شأن)یێ وەك (شأن)ی خوای، (علم)یێ (محيط)وەك خوای، (قدرەت)یێ (شامل)وەکی (قدرەت)ی خوای؛ (حاشا ثم حاشا) (حضرەتی كبريائى)لە (شؤون)ی خۆی بۆ خۆی (إختيار)ی نیە (مُقتضيات)ی (ذات) (مدخل)ی (إختيار)ی تیانیە؛ چۆن ئەیدا بە (غَير)؟ (أمر)ی هەر ئەوە ﴿إِذَا أَرَادَ شَيْئًا﴾ هەرچی ببێ ﴿أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾وەکی (سابقاً) (عرض)کرا تەماشای (موقع)ی (آية)کەن، دیارە ئەو (أمره) أمرێ (تكوينى)نیە؛ (عالَم)ی (شريعەت)بە (أمر)ی (تكليفى)، (عالَم)ی (طبيعة)بە (أمر)ی (تكوينى)، کەوابێ لەگەڵ (خلق)ی (باليد) (باليدين)، (بالأيدى) (مُنافى)نیە ﴿فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ﴾ (مبالغە)یە لە (مُلك)وەکی (رَحَموتُ)لە (رَحمة)ن (رَهبوت)لە (رهبة)، (مالكى)خوای وەکی (مالكى)خەڵکی نیە؛ بە هەموو (نَوع)آن؛ (كائنات) (مُلك)ی خوایە؛ (إيجاد)ی ئەکا بە (فَنا)ی

ئـەبا (یتصـَّرفُ فیـهِ کیـف یشـاءُ) (دائمـی)یـە (لانقطـع)ە ﴿کُـلِّ شَـيْءٍ﴾ لـە: (عُلویـّات)و (سُـفلیّات)و (مادّیـا)و (حیّـات)﴿وَإِلَيْـهِ﴾ (لا إلى غـیره)﴿تُرْجَعُـونَ﴾ ئەگـەر (خطـاب) (عـام)بـێ بـۆ (مـؤمن)و (کـافر)، (وعـد)و (وعیـد)ە؛ ئەگـەر (خطاب)لەگەڵ (مُنکر)آن بێ، (وعید)ە (نعوذُ بالله من وعیدە)باکـەمێ قسـە لـە (إعـادە)ی (أجسـام)ی (أحیـات)بکـەین؛ کەسـێ (تأمّـل)بکـا، لـە (منعـی)ی (إعادە)ئەزانێ (معدوم)ی (صِرف) (إعادە)ناکرێ؛ (حتّـی)بـە (بَداهـەت)ئـەزانێ (إعادە)ی (معـدم)ی (صـرف)، (مُحـال)ە. (زیـد) (مـثلا)چووە (کـتم)ی (عـدم) (شخص)ێ (خلق)کـرا، هەرەچـی ببینـێ، وا ئـەزانێ (زێـد)ە ئـەوە (زیـد)نیـە؛ کەسێکە (إبتدءً) (خلـق)کـراوە، (لکـن)زۆر ئـە(شُـبهی)بـە (زیـد). (إمـام) (فخـر الدین)گەرچـی زۆر (مجادلـە)ئەفـەرموێ، لەسـەر (إعـادە)ی (معـدوم)، (آخـر)ی ئەفـەرموێ: " (بالبداهـە)دیـارە (إعـادە)ی (معـدوم)، (مُحـال)ە" (بنـاءً علیـه) (إعتقـاد)ی (سـواد)ی (أعظـم)لـە (عُلمـا)ی (إسـلام) (حتّـی) (شـێخی إبـن سینا)ئەمەتە: (هیاکل)ی (إنسانی)لە (أجزا)ی (متفرّە)ی گرد ئەکرێتـەوە، هـەر (هیَکل)ێ (روح)خۆی ئەچێتە وەبەری.

سەرداری (حُکمـا)ی (إلهیـون) (أفلاطـون)وەکـی لـە (کتـاب)ی (مجـادلات)ی (أفلاطـون)وەر ئـەگێرێ، (عینـاً)وەکـی (رسـول)ی (کـریم)وە (عُلمـا)ی (تحقیق)ئەفەرمووێ: (روح)ی (بشر) پێش (بَدَن) موجودە، ئەچێتە نـاو (بَـدَن) (حیات)ی پێ ئەدا، (بَعْدَهُ)ئەچێتەدەر، وەئەمێنی.

(لکن) (فلاسـفە)ی (یۆنـان) (حشـر)ی (أجسـاد)یـان لاینـە، بـەس (حشـر)ی (أرواح)ی هەیە.

(بعض)ێ لە (أمّەت)ئەفەرموون:" ئەو (بَدَن)ە (إعادە)ناکرێ، (بَـدَن)ێ تـری بۆ (إیجاد)ئەکرێ؛ (أمّا)ئەو (قسە) (بِالْکُلِّیَّة)لەگەڵ (آیة)و (حـدیث) (مُخـالف)ە. (بعض)ێ ئەڵێن:" ئەو (روح)ە (ذاتـاً) (جسـم)ێ (لطیـف)ە خـۆی بـێ (بـدن)ی

(نشر)و (حشر)ئـەکرێ؛ ئـەو قسـه (ممکـن)ە (تطبیـق)ی (آیـات)و (أحادیـث)ی لەسەر بکرێ.

(أمّا) (روح)بە (معنی) (جەوهەر)ی (مُجرَّد)بێ، کە (مُنزَّه)بـێ، لـه (مکـان)و (تَحیّز)هەرچەند (أرسطو)و (شێخی إبن سینا)و (إمامی غزالی)و (کباری صوفیه) (إختیار)یان کردیه، (أمّا)من پێ ی (راضـی)نـیم؛ زێـرا (وجـود)ی (خـارجی)بـۆ (أمـر)ی (مُحقَّـق)بـێ (حیّــز)نایەتــه (عقــل)، بـەس بـۆ (واجـب الوجــود) (قبـول)ئـەکرێ، زێـرا (وجـوب)ی (وجـود) (مـانع)ە لـه (حاجـەت)بـۆ (مکـان)و (تحیّــز)و (شـکل)و (تَعَـیُّن)بــه (أمـور)ی (زائـده)کەلـه (لـوازم)ی (وجـود)ی (ممکنات)ە.

(عجایب)ئەمینم له (طوسی)، (ذاتاً)له (بعض)ی (تحریرات)ی خـۆم (طعـن)م لێ داوه، ئەڵێ:" (تقدّس)له (حَیُّز) (مدلول)ی (وجـوب)ی (وجـود)ە" (مـع أنّـهُ) (إعـتراف )بـه (تّجـرد)ی (روح)ی (إنسـانی)ئـەکا، وەنـاتوانێ (جزمـاً) (إنکـار)ی (عقول)ی (مُجرَّده)بکات، کە (حکما)ی (إلهیّون) (قول)یـان پـێ کردیـه؛ ئەگـەر (حیّز)به (معلوم)ی (مدلول)ی (وجوب)ی (وجود)ە، له (ممکن)چۆن دێته جـێ؟ (شێخ)ی (رئیس)پاش (إثبات)ی (حشر)ی (أجسام) (فقد قال به سیّدنا ومولانا (محمـد مصـطفی) (ﷺ)؛ (فَآمَنّـا بِـه)" (ذاتـاً)ئیمـەش وا ئـەڵێن: (حشـر)ی (أجساد)به (نقل) (ثابت)ە، بـه (مُجـرّد)ی (عقـل)نازانـدرێ" (مـع أنّـهُ) (شـێخ) (قائـل)ە بـه (هَیُـولا)و (صـورەت). (حقیقـةً) (قـول)بـه (هیـولا) (صـورەت) (مانع)نیه، له (قول)به (حشر)ی (أجساد)و (إعاده)ی، له (عناصـر)ی (أوّلی)کـه (مُرکـب)ە لـه (هیـولا)و (صـورەت)، لـه (صـورەت)ی (جـوهر)ی (هیـولا) فـەك نابێتەوه ئەو (صورەت)ەی له (هیکل)ی (إنسانی)جودا ئەبێتەوه، (صورەت)ێ (عَـرَض)یـه؛ لام وایـه، کـەس نـاڵێ:" (إنسـان) (قـدیم)ە (حتّـی)بـه (نـوع)؛ (وَلَـوْ)بڵـێن:" (أرواح)ی (مُجـرَّده) (قـدیم)ن " (إنسـان) (بـدأ)ی (وجـود)ی (زمانی)یه (داخل)ی (عالم)ی (إستعدادی)یه.

(بعض)ی لە (فرق)ی (إسلام) (إنکار)ی (حشر)ی (أبدان)ئەکەن؛ هەندی؛ (شُبهات)ئێنن؛ (کافر)ێ (مُسلّمان)ێ بخوا، چۆن زیندی ئەبێتەوە؟ ئەگەر (کافر) (تابع)ی (مُسلّمانان)بێ، بۆ (جنّەت)، نابێ؛ (مُخلّد)ی، نابێ؛ (خلود)بۆ (مُسلّمان)نیە، (خصوص)ئەگەر (مسلّمان)ەکە (مُتّقی)بێ نابێ، بچێتە (جهنّم)؛ ئەوانە هیچ نین؛ ئێمە (بِحْولِه تعالی)ئەچینە بەهەشت؛ (بَدن)مان (مرَکب)ە، لەو (عناصر)ە، کەلە (نباتات)و (حیوانات)وەرئەگیرێ؛ ئەبێتەوە (هیکل)ێ (إنسان)ی. (واقعاً) (نظر)بە (بعض)ێ ئیش، (تصدیق)بە (إعادە)ی هەموو (أجزا)ی (إنسان) (مُشکل)ە، (لکن) (نظر)بە (عِلم)و (قدرەت)ی (صانع)ی کیمیا گەری خوایی زۆر ئاسانە.

من (إعتقاد)ی (تامّ)م بە (إعادە)ی (هیاکل)ی (إنسان) هەیە؛ لام وایە (روح )(جوهر)ێ (ساریە)لە (بدن)، پاش چوونە دەر، ئەمێنن.

وە (تفسیر)ی (أحوالَ)ی (برزخ)م لا (مجهول)؛ خوا ئەزانێ چیان لێ ئەکا، چیان بەسەردێنێ؟ وەلام وایە (بَدَن)ی (إنسان)سێ (روح) (إدارە)ی ئەکا: (نفس)ی (نبات)ی؛ کە (تنمیە)و (تغذیة)و (سائر)ی (أحوال)ی (نبات)ی، لە وێ یە؛ (مشترك)ە، لە (بین)ی (إنسان)و (حیوان)ی دی؛ (روح)ی (إنسان)ی کە (جوهر)ێ (مُدرك)ە، (حتّی)بۆ (کُلیّات)؛ (مُدبِرّ)ە، (واضع)ی (علم)و (قوانین)ە، (مخترع)ی (صنایع)ی (عجیبە)؛ هەر (عمل)ە بۆ (روح)ێ؛ (أعمال)ی (نبات)ی لە (عُمال)ی (نبات)ی (صادر)ئەبێ، لە (هیکل)ی (إنسانی)دا. (مع أنّه) (روح)ی (حیوان)ی، (روح)ی (إنسانی)هیچ ئاگاری لێ نیە. خوێن (دوران)ئەکا، (قلب)لێ ئەدا، (طعام) (هضم)ئەبێ، (تحویل)ی ئەکا بە (أعضا)ی (مخصوص)ە؛ خوا ئەزانێ (روح)ی (إنسانی)بێ (خَبَر)ە، وە (إلاّ)ئەبا (شعور)ی بەهەمووی ببی خۆ دیارە وانیە؛ ئەگەر (تفصیلات)ت ئەوی، تەماشای (کُتب)ی (کلامی)و (تفسیر)ی (روح المعانی)کە، (حقاً) (سیّد المُفسرین)لەو (مقام)ە، (حشر)ئەکا؛ (رەحمەتی خوای لێ بێ)؛ (آمین) (وکذا) (لسائر)ی (علمای) (إسلام)و (الصلات

والسلام على سيّدالكل، سيّدنا ومولانا، محمد المصطفى وعلى آله وأصحابه وأتباعه إلى يوم يُبعثون) (لله الحمد).[1]

(نوبەت)ى (سورە)يى (صافّات)ە خودا (كرم)كا، بىّ(علايق)و (عوايق)بە (حيات)ى (طيبة) (تفسير)ى (كريم)تەواوكەين.

سورة الصّافات

ع ناوى تر بۆ (ذكر)ناكەن (بالاتفاق)ئەفەرموون: "(مَكى)يە" (عدد)ى (آيات)ى (١٨١)سەدو هەشتاو ويەك، لاى (بصرى)يان؛ دوو، لاى ئەوانى دى.

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

بەناوى خواى، خوايە بە (مرحمەت)و (كرم)ى خۆت، (إعانە)مان بدەى (دفع)و (رفع)ى (عوائق)كەى ﴿وَالصَّافَّاتِ صَفًّا﴾ خۆيان (صف)ئەبەستن؛ يا (صف)آرايى ئەكەن ﴿فَالزَّاجِرَاتِ زَجْرًا﴾(سوق)ئەكەن، (منع)ئەكەن، (نهى)ئەكەن ﴿فَالتَّالِيَاتِ ذِكْرًا﴾ (آيات)ى (إلهى) (تلاوەت)ئەكەن؛ ئەوانە كێن؟ (زمخشر)ى و (فخرى ڕازى)چەند (وُجوە)يان فەرموو. لە (تفسير)ى (إبن جرير)و (سائر)ى (تفاسير)ى كەلاى ئێمە هەيە؛ (كَشاف)، (تفسير)ى (كبير)، (بيضاوى)، (نيسابورى) (إرشاد العقل السليم)، (روح المعانى)، (مراجعە)ى (خازن)ناكەم، وا دەر ئەكەوێ (مُختار)ئەمەيە، كە (عبارەت)ن لە (ملائكە)، لەبەر (جمع)ى (مؤنث) (أبو مسلم)بەو قسە (راضى)نيە؛ (إمام) (جواب)ى دايتەوە، (ذاتاً)وەكى ئەڵێن: " (باب)ى (تذكير)و (تأنيث)لە (باب)ى بەهەشت (واسع)ترە" من (عرض)ئەكەم من ئەڵێم:" بە (مناسبە)ى (سورەت)ى (ياسين)، كەلە (أوّل)ى (جنابى حق)سوێند ئەخوا، بە (قرآن)ى (حكيم)،

---

[1] – تەواو بوو بە (عوايق)ى زۆر خودا بە (ڕەحمەت)ى خۆى (رفع)و (دفع)يان كا، (تفسير)ى (سورە)ى (ياسين)ڕۆژى سێ شەموو ٩/ شوال ؛ ٨ تشرينى ثانى ڕۆمى (سنە) (١٣٥٨هـ) (١٩٣٩م).

لەسەر (رسالە)ی (رسول)ی (أکرم)؛ وەبە (إعتبار)ی (مُناسبە)لە (بین)ی سوێند پێ خوراوو لەسەر خوراو، (لازم)ە (معنا)یان بە شتێ لێ درێتەوە، کە (مناسب)ی (جواب)ی (قَسَم)، (یعنی)﴿إِنَّ إِلَهَكُمْ لَوَاحِدٌ﴾ بێ؛ (بناءاً علیه)ئەوانە، (عبارەت)بن لە (زُمرە)ی (رُسُل)و (أتباع)یان؛ کە (آخذ)ی (آیة)و (شارح)و (مُبین)ی (دلائل)ی (ذکر)ی (حکیم)ن؛ زۆر (موافق)ە؛ (قَسَم)بە (قرآن)لەسەر (رسالەت)ی (حضرەتی محمد)، (قسم)بە (حَمَلە)ی (قرآن)و (أقوال)ی (إلهی)لەسەر (وحدانیەت)ی (کبریائی)؛ چەند جوانە؛ (رابطة)یە چەند بە (قوەت)ە؛ (نظم)ی چەند (مُنسَجِم)ە؛ وە (زیدە)ە (إتصال)لە (صدر)ی (سورەت)ی (آتی)دەرئەکەوێ؛ (علاوة) (مخاطب)لێرە، (عین)ی (مُخاطب)ن، بە (آیة)ی ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾؛ (إلهی)ئێرە، ئەو (إلیه)وێ یە؛ وە (سِرّ)ێ تریش هوەیدا ئەبێ؛ (جنابی حق)بە (مُجرّد)ی سوێند (إثبات)ی (رسالەت)ی (رسول)ی و (وحدانیەت)ی خۆی ناکا، بەڵکو بە (مضمون)و (محتویات)ی (محلوف علیە). (جنابی حق)، (ذات)ی (واجب الوجود)، یا (وجود)ی (واجب الوجود)؛ (واحدی)یە؛ (حقیقةً) (حتّی) (إعتبار)ی (تعّدد)ی (إعتبار)یش، بۆ (ذات)ی ئەو (ملاحظة)و (تصّور)ی (مُحال)ە؛ (لکن) (واحد)ێ (طبیعی)نیە، کەبە (میل)ی (قوەت)ێ (واحد) (لایَصْدرُ مِنْهُ إلاّ شَیءٌ واحدٌ)بێ نەك (واحد)ی (حقیقی)، نەك (واحد)ی (بالذّات)، بەڵکوو(واحد)ی (بالشخص)نابێ بە دوو؛ دوو نابێ بە (واحد)ی (شخص)؛ بەڵێ لە دوو (شخص)آن، (شخص)ێ (ثالث)ی لێ پەیدا ئەبێ؛ وەك دوو ئاو تێکەڵاو ئەبێ، ئەبێتە ئاوێ؛ (لکن)یەك یەك لە ئاوەکان؛ (تشخّص)یان نەماوە؛ (تشخّص)ێکی دی پەیا بوە؛ (سرمدآنی) (دین)ی (یسوع)، یا بە (غلط)یابە (مُغالطة)لە (معنا)ی (وحدەت)زۆر درشت و (عاصی)یانە قسان ئەکەن ئەگەر بنۆڕیە (جهەت)ی (وحدەت)ی (عالَم)بە هەموو (کُرات)و (کائنات)ی یەك (وحدەت)ی (عالم)ە؛ ئەو ((إلە)ە (واحد)ە ﴿رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ

﴿الْمَشَارِقِ﴾ئەگەر (منازعە)ی (سُنی)و (معتزالی)نەبێ، (أفعال)ی (مُكلَّفين)لێرە نایەتە(خیال)؛ ئایا (مخلوق)ی خوایە؟ یا (مخلوق)ی (مأمورُ بها)یە؟ بەڵێ (شامل)ی (نفس)ی (إنسان)ە، وەکی (سائر)ی (حیوانات)ی دی؛ (تصریح)بە (مشارق)بۆ (جَلب)ی (نظر)ە بنۆڕە (کواکب)و (شمس)و (قمر)، بە چ (وضع)و (ترتیب)ی هەڵدێن، بڵند ئەبن، لە (جَوّ)ی (سما)ئەدرەوشێتەوە! (فی الحقیقة)مقام)ی (شروق)ی (أنوار)ە؛ (أنوار)ی (علم)وە (إیمان)بە (آیات)ی (قَولی)و (کَونی)؛ (مشارق)ی (شمس) (نظر)بە (حِس)، نیوە (مشارق)ە (نظر)بە (مدارات)ی (یومیَة )کە (حَوْل المنطیقة) (ترسیم)ئەکرێ؛ (سیّارە)هەم (مشرق)ی (یومیە)ی هەیە، هەم (مشرق)ی (حرکە) (خاصّە)ی هەیە؛ لێرە (نظر)بۆ (مغارب)نیە؛ چونکی جێ ی (أُفول)ە ئەویش وەکی (قِصة)ی (إبراهیم خلیل الرحمن) (موقع)ی خۆی هەیە. ئەو (نظم)و (وضع)و (ترتیب)و (فوائد)و (عوائدة)لە (إله)ێ (علیم)و (قدیر)و (قویّ)و (صاحب)ی (إرادە)ئەوشێتەوە؛ بت و (أصنام)لەکوێ؟ ئەو (خلق)و (إیجاد)ە لەکێ؟ ﴿إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ﴾ (أساساً)ئاسمانەکان نابیندرێن، (کُرات)ی (لامعە) (مشاهدە)ئەکرین؛ ئەو ئاسمانەی (زینەت)دراوە، بەو (کواکب)و ستارەی دەرخشندە، بۆ ئێمە، ئاسمانی (دُنیا)یە (قُربا)یە؛ ئەویدی (داخل)ی (دنیا)یە، بەلاوەیە؛ چیە؟ چ نیە؟ (علم)ی ئێمەی پێوە (لاحِق)نابێ؛ ئەوی هەیە، لە ئێمە دوورە ﴿وَحِفْظًا﴾پاراستوومانە؛ (ممکن)ە (نصب)ی بە (فعل)ێ (مُقدَّر)بێ، یابە (عطف)ێ (معنوی)بێ؛ (معنا)ی (عبارەت)ی پێشی؛ (کأنّە)ئەفەرمووێ: "( إِنَّاخَلَقْنا الْكَوَاكِبَ زَيِّنَةً السَّمَاءِ وَحِفْظًا)" (لکن)ئەو (حفظ)ی ئەوان ئەفەرموون، وەئەوەی من ئەی لێم؛ لێك جودان ئی وان (حفظ)ێ (حِسّی)یە، ئی من (حفظ)ێ (معنوی)یە؛ (جنابی حق)بە (حجاب)ی (بصیرەت)یان، (حفظ)ی ئاسمانی (مُزَیَّن)بە (کواکب)ی کردیە ﴿مِّن كُلِّ شَيْطَانٍ مَّارِدٍ﴾ (شیاطین الإنس)ڕووت لە (خیرات)﴿وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ﴾ تەماشای ئەو

(صُنع)ە (بدیعە)ناکەن، (محروم)ماین، لە (علم)بە (آیات)و (أسرار)ی (کائنات)ی (نَیِّرَة)چ جایە (مَستورە)﴿ لَا يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلَإِ الْأَعْلَى﴾ گوێ لە (آیات)و (ذکر)ی (إلهی)ناگرن، کەلە لای (عالَم)ی (عُلوی)بە (واسطة)ی (مَلَك)برەبرە، بۆ (رسول)دێ؛ نەخۆیان ئەتۆڕن، نە (إستماع)ئەکەن ﴿وَيُقْذَفُونَ﴾ بۆیان ئەهاویترێ ﴿مِن كُلِّ جَانِبٍ﴾ لە (جهەت) (أوهام)و (خیال)و (هوا)ی (نفس)؛ وا دەرئەکەوێ، ئەوانە ئەگەر گوێ بگرنە (آیات) (تلویس)ی ئەکەن، بۆیە خوا لە (لَوس)یان (حفظ)ی ئەکات ﴿دُحُورًا﴾ بۆ (طرد)و (تبعید)لە (إدراك)ی (آیات)ی (مَلکوت)و (سموات)﴿وَلَهُمْ﴾ لە (دنیا)و (آخرەت)﴿عَذَابٌ وَاصِبٌ﴾ (دائم)، (شدید)تێ نا (فکر)ن، گوێ نادنێ، بە (عمومی)﴿إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ﴾ تێ ی ڕۆیی، بیفرێنێ، بە (وجە)ێ کە (معهود)یانە؛ وەئێوەش ئەی زانن، ئەم (خطف)ە بۆ تێ گەیشتن و (تحصیل)ی (علم)نیە (وإلّا)بە (تفکّر)و (تدبّر)و (تخیّل)ێ (صحیح)ئەبوو. شتێ ئەبیەن، یا (نوعاما)تەماشا ئەکەن، بە (أوهام)ی (باطلة) (شُبهە)یە (واهی)، قسەیە پڕو پوچ دەرئەخەن (عوام)ی پێ (إضلال)ئەکەن؛ ئەوە (دلیل)ی (نحوسەت)ە، ئەوە (دلیل)ە، لەسەر شەڕی (ملك)ی (بابل)و (خراسان)چونکی (شَعْری)بەو لاو بەولا دا دەڕوا؛ بی پەرستین. ئەو (کواکِب)ە (مُدبِّر)ن؛ (حتّی) (بعض)ێ لە (أهل)ی (عقل)سەر ڕۆشتەیی (عقل)بزر ئەکەن؛ واگومان ئەبەن (صعود)و (نحوس)ی (بشر)لەو (کواکب)انەیە؛ (أمّا) (خیّام)ئەڵێ:

أجرامکی ساکنانی این ئەیوانەنــد

أسبابی تردّدی خیرەر مەندانەنــد

هاتا سەر روشتەیی خیرد گوم نەکونی

کانانکە مُدیرەند، سەر گەردانەنــد

﴿فَأَتْبَعَهُ﴾دوای ئەکەوێ، لە (طرف) (علما)ی (تالی ذِکر)، (ناظر)و (عارف)بە (حقائق)ی (کائنات)، (عالِم)بە (هیئەت)ی (موجودات)﴿شِهَابٌ ثَاقِبٌ﴾ (نور)ێ

(ساطع)ی (برهانی)، (نافذ)و (قاطع)، بەدوای (شُبهات)و (أوهام)ی وان ئەکەوی، (تصحیح)ی ئەکات؛ ئێمە وامان (تفسیر)ی ئەو (آیات)ە، کردوە؛ (معقول)و (مقبول)ە. ئەوەی ئارەزووی (تفسیر)ی (روایات)ە، (کیف)ی لێ یە، گوێ لە جنۆکان ڕاگرێ، بچێتە سەر (مذهب)ی (کاهِن)آن (مراجعه)ی (تفاسیر)ی تریکا؛ (خاصةً) (روح المعانی)؛ ئەوەندە (عرض)ئەکرێ، (معلوم)ە لە (کتب)ی (یۆنانی )لە (أشعار)ی (عربی)ئەو (شُهُب)ە، (محسوسه) (قبل زمان الرسول)، (بَلْ) (قبل زمان المسیح) (بَلْ)خوا ئەزانێ، بە چەند هەزار ساڵ ئەستێرە داڕژرا نەك هەیە، (نادِر)ە، لە زۆر (غریب)ە؛ من لە (أوائل)ی (منداڵیم)، (دیم)؛ شەوێ ئەستێرە لە (شمال)و (جنوب)و (شرق)و (غرب)وەکی لە(شکری) (هجوم)یان ئەکرد، بۆ (جهەت)ی (منطقة)، (عالَم)کەوتە (دهشەت)تاسبەینێ (دوام)ی کرد؛ نازانم بەڕۆژ مایان نەما؟ (أمّا)بۆ شەوی (آتی)ئەو (حال)ە نەما؛ (أمّا) (شُهب)ەکان (مُکدَّر)بوون، وەکی ئەوانی جارجار ئەبێ؛ ڕووناك، (مائل)بەسەبزی یابە سووری نەبوون (ممکن)ە لە (أوائل)ی (رسالەت)ی (رسول)ی (أکرم)شتێ وا بووبێ؛ وابزانم دیمە لە (تأریخ)لە (زمان)ی (عبّاس)یانیش شتی وابوە. وەئەڵێن: " بەشەش سەد ساڵ جارێ وائەبێ" (والعلم عند الله)ئەو ساڵی من ئەڵێم: (حضرەتی کاك أحمدی شێخ) (وفات)ی کرد؛ (حتّی)گەلێ (جَهلة)ئەیان ووت:" لەبەر (وفات)ی وی بوو!" وابوو (تأریخ)هەزار سێ سەدو چوار یا پێنج بوو ﴿فَاسْتَفْتِهِمْ﴾ (طلب)ی (فتوی) (خبر)لەو (شیاطین)آنە بکە؛ گوی یا بە(قوەّت)ی خۆیان (مغرور)ن؟ (حقیقةً) (قوەّت)ی (جهل)ە، (وَلَوْ)زۆر بە (قوەّت)و (مُکنّەت)بێ ﴿أَهُمْ أَشَدُّ﴾

(أقوا)و (أمنت)ن ﴿خَلْقًا﴾ کەبتوانن، (مُعارضة)و سەرپێچی لە ئێمە بکەن ﴿أَم مَّنْ خَلَقْنَا﴾ لە (مذکورات)؛ (سماوات)و (أرض)و (مابین)ی یان ﴿إِنَّا خَلَقْنَاهُم﴾ ئەو (شیاطین)آنە ﴿مِّن طِينٍ لَّازِبٍ﴾ لیچ وەك کەتیرە؛ (لَعلّ) (مُراد) (نطفة)یە، (ممکن)ە بە (إعتبار)ی (أصل)ی (آدەم)بێ؛ کەسێ ئەوانە لەقوڕ دروست کا، ئەتوانی بە (خلق)ێ (جدید) (إنشا)یان کاتەوە ﴿بَلْ عَجِبْتَ﴾ لە (جهل)یان بە (آیات)ی (کونیَة)﴿وَيَسْخَرُونَ﴾ قەشمەری پێ ئەکەن؛ (حقاً) (بشر) (عجیب)ە (إختراع)ێ وەکی (رادیۆ)، (عُلما)ی (مُتَبحّر) (مُتحیّر)ئەکات، گەلێ (جهلە)گەپی پێ ئەکەن؛ (حتّی) (سُفلی) (ملا)یان ئەڵێن: " گوێ لێ گرتنی (حرام)ە" جا وەرە (أمّة) (تعالی)کا؛ بە (صُنع) (أسرار)ی (خلق)ی خوا بەدەرخا ! ﴿وَإِذَا ذُكِّرُوا لَا يَذْكُرُونَ﴾ نە (وعظ)نە (إرشاد)نە (دلائل) (تأثیر)لەوان ناکا ﴿وَإِذَا رَأَوْا آيَةً﴾ (مُعجِزة)یە (دال)لەسەر (صدق)ی (رسول)﴿يَسْتَسْخِرُونَ﴾ (زێدە)ە قەشمەری ئەکەن، (حتّی)پێ ی ئەڵێن:" (سحره)" (طبیعی)بە (آیات)ی (کَونیّة)ناتوانن بڵێن:" (سحره)" یاخود لێك (طلب)ئەکەن، کە قشمەری بە (رسول)و (آیة)ی بکەن ﴿وَقَالُوا﴾بە (سُخریّە)﴿إِنْ هَذَا﴾نیە ئەوە ﴿إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ ئاشکرا، (یعنی)بێ (أصل)ە، بۆیە ﴿أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا﴾(أجزا)ی (رَخوَه)﴿وَعِظَامًا﴾هێسك، درەنگ ئەڕزێ؛ ئاگایان لە(أجزا)ی (ناریە)و (هواء)یە بڵاو ئەبێتەوە؛ وە (إلاّ) (بِالکُلّیّة)ئەیان کردە، قشمەری کە بووین بە خۆڵێ و هێسك ﴿أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ﴾ زیندی ئەکرێنەوە؟ ﴿أَوَآبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ﴾ ئەوانیش کە (عظام)یان نەماوە، (بعث)ئەکرێن؟ چاکە (شُبهات)ی (بعض)ێ لە (فِرق)ی (إسلامی)یان نەیانزانیوە، وە (إلاّ)بە جارێ ئەیان کردە، گاڵتەو ڕیشە

خەندە؛ (لكن بعد الآيمان)بە (كمال)ی (علم)و (قدرەت)ی (كبريائی)، بەڵكو (إيمان) بە (ألعاب)ی (طبيعة)ئەوەی لای، دوور نیە؛ ئەزانی بە (سهل)ی ئەكرێ، بە (سهل)ی (إيمان)ی پێ ئێنێ؛ وە بۆ (إصلاح)ی (نفس)خەریك ئەبێ، باوەڕ مەكە، لەهەزاری یەك (إنكار)ی (بعث)بكات. لە (جهەت)ی (نظرية)ی (علم)ی گۆی یا (حق)و (حقيقەت)ی ئەوێ؟ بەڵكو بۆ (إستراحەت)ی (نفس)ە، بێ (دغدغه)و (خطرة)بە (كمال)ی (لذەت)، (عيش)و (عُشرەت)ی خۆی بەجێ بینێ! ﴿قُلْ نَعَمْ﴾خۆتان و (آبا)تان (بعث)ئەكرین ﴿وَأَنتُمْ﴾(أولين)و (آخرين)تان ﴿دَاخِرُونَ﴾(محقر)و (مصغر)و (أذلّ)آن؛ (خلاف)ی (عليم)، (بعث)ی ئێوەی لەبەر (عاصی)نابێ؛ (أرض)و ئاسمان، (طوعاً و كرهاً) (مطيع)ی (أمر)ن ﴿فَإِنَّمَا هِيَ﴾(بعث)تان ﴿زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ﴾بە بانگی (غالب)آنە، ئێوە زیندی ئەبنەوە ﴿فَإِذَا هُمْ﴾كە زیندی ئەبنەوە ﴿يَنظُرُونَ﴾ (يعنی)چاو بە (نزاكەت)ی (طبقات)ی (رقيقه)ی وە (إناره)وە ألنجەی (قيقه)ی (إعاده)ئەكرێتەوە؛ پێ ی تەماشا ئەكەن، وەكی (دنيا)﴿وَقَالُوا﴾ زیندوو بوەكان ﴿يَا وَيْلَنَا﴾ (واويل)﴿هَذَا يَوْمُ الدِّينِ﴾ ڕۆژی (جزا)یە؛ (كما تَدين، تُدانُ) (ملائكه)يا (رأساً) (جنابی حق)لە (مُقابل)ی ئەو قسە، ئەفەرموون: ﴿هَذَا يَوْمُ الْفَصْلِ الَّذِي كُنتُمْ﴾ لە (دار)ی (دنيا)﴿بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾ (تكذيب)ی (رسول)تان ئەكرد؛ ئەتان ووت: " ئەوڕۆژە، نابێ؛ (ممكن)نیە" ئەو ە ڕۆژی (فشل)و (قضا)و (حُلكم)ە، ڕۆژی (فرق)و (تمين)و لێك جودا كردنی، (مُحسين)و (مُسيء)ە؛ (تأجيل)نەما ڕۆژی (إنقاذ)و (إجزا)ی (حُكم)ە ﴿احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ (أمر)ە لە (طرف)خوا، بۆ (مأمور)ی (مُكلّ)ی (حشر)بۆ (حساب)يا بۆ

(دار)ی (عذاب)﴿وَأَزْوَاجَهُمْ﴾(مقابل)ی (أزواج)ی (مؤمن)آن؛ (حقاً) (كُفر)ی پیاوان لەمەڕ ژنانە (خصوص)ئەمڕۆ زۆر ئاشکرایە؛ گەلێ لە (ئاورِوپای) (حظ)ئەکەن (مسلّمان)بن، ژنیان (مانِع)ە؛ (سبب)بە (مُحقَّری) (معامله)ی (مسلّمان)آن لە (حق)ژنان؛ وا دەزانن، (مقتضا)ی (دین)ی (إسلام)ئافرەتەکان (تنفّر)ئەکەن؛ وەئەو (کشف)و (کیف)ی (مسیحی)پێ یان ئەدات، (دین)ی (إسلام) (طبیعی)پێ یان نادات. لە (فاروق)ی (أعظم) (نقل)کراوە، (تفسیر)ی (أزواج)بە (أمثال)و (أشباه) (یعنی)ئەوانەی وەکی وانن، لە (عمل)ی (سَیِّ)؛ هەریەك لەگەڵ هاو (عمل)ی خۆی (حشر)ئەکرێ، (وَلَوْ) (کافر)یش نەبێ؛ (رِبا)خۆر لەگەڵ (ربا)خۆر؛ (زانی)لەگەڵ (زانی)؛ (شراب)خۆرەوە لەگەڵ (شراب)خۆرەوە، ئەمە بۆ (مُسلّمان)آن (إنذار)ێ (عظیم)ە؛ بە خوا (حقّ)ە، ئەو (رمضان)ەو گەلێ (رمضان)ی تر، (جمع)ێ لە (مسلّمان)آن، بەڕۆژ ئەچوونە ماڵی جوولەکان، ئەیان خواردو ئەیان خواردەوە؛ ئەمانە بۆ لەگەڵ جوان



(حشر)نەکرێن؟ ئەمساڵ (بعض)ێ ئەچوونە (خلا)خانان؛ قەسپ و هەناریان ئەخوار؛ (أمّا)نازانم ئەوانە، لەگەڵ کێ (حشر)ئەکرێن؟! لام وایە، نە جوو، نەدیان، نە بت پەرست، نە (لادینی)ئەو (دنائەت)و (خسّەت)ە ناکا ﴿وَمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ*مِن دُونِ اللَّهِ﴾ (أصنام) (وما على شاكلته) ﴿فَاهْدُوهُمْ إِلَى صِرَاطِ الْجَحِيمِ﴾ نیشانیان دەن، بۆیان (تعریف)کەن (حشر)یان بۆ (حساب)بۆیە یە، (حشر)بکرێن، بۆ (جحیم)بۆیە (بعد هذا الأمر)ئەفەرمووێ: ﴿وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ﴾ لە (أعمال)ی (ظالِم)آنە یان، لە (کُفر)یان، لە (منشأ)ی (شرور)یان؛ (أمّا) (سؤال)لە (ولایەت)ی (علی) (طبیعی)لەوانە ناکرێ؛ (کافرن)؛ (أمّا) (سؤال)لە (شیعە)آن ئەکرێ، ئایا (ولایەت)ی (علی)تان، بەڕاستی بوو؟ یا بۆ

(جلب)ی (دنیا)و تێکدانی (وحدەت)ی (إسلام)بوو؛ (إنتقام)لە (إسلام)لەبەر (مجوسی)یە؟ (أمّا) (عداوەت)ی (أعدا)ی (إمامی علی)وە (أسباب)ی (فَأظهرُ مِنْ أنْ یُنكَرَ)ئەوان لە (میدان)ی کار، بەزارو بە (بارقە)ی (سیوف) (إعلان)یان ئەکرد؛ (طبیعی)ئەو شەڕو شۆڕە، کە بووە (منشأ)ی (هدم)ی (صریح)ی (إسلام)، ڕۆژی (جزا)لێ ی ئەتۆزرێتەوە هەرچەند ئەو (آیة)ە، لە (حق) (کافر)آنە؛ (أمّا)وئەبێ (مُسلْمان)تەواو زۆر بترسێ، بە (دِقّەت)خۆی بپارێزێ؛ وام لە (خاطر)ە، (روایە)کراوە، (عمر بن عبد العزین) (رضوان الله علیە)شەوێ لە (تهجّد)دا ئەو (آیة)ە ئەخوێنێتەوە، تا (وقت)ی (فجر)لەسەر پا، ڕادەوەستێ، (دهشەت)ئەی گرێ، ئەگریە، ئەو (آیات)ە (تکرار)ئەکاتەوە سبەینێ (عرض)ی ئەکەن، ئەفەرمووێ: " وام هاتە بەر (نظر)کە (أمر)درا، من ڕاگرن، (سؤال)م لێ بکەن؛ (خشیەت) (إستیلا)ی بەسەرا کردم، نەمتوانی (حرکە)بکەم" ئا، وا ئەبێ نابێ (رئیس)ی (دین)یا (دنیا)بە (کیف)ی (هوا)ی خۆی بکا، و بڵێ: " من (شیعە)ی (علی)م، (خلیفە)ی (فلان) (شێخ)م؛ (أتباع)ی ئەوانە (مغفورن)" ﴿مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ﴾ نە خۆبە خۆیی، نە لەگەڵ(إلە)تان؛ چتاق لا (نصرەت)ی چتاق لا نادەن؛ یارمەندەتی ناکەن. لە (دنیا) (مُعین)ی یەك بوون؛ چەندێ (مُهیا)بوون بۆ (نصرەت)ی (إلە)کانتان؛ وە ئەوانتان بە (ناصر)ی (معنوی) (حساب) ئەکرد ﴿بَلْ هُمُ الْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ﴾ (منقاد)ن، بێ دەسەڵاتن ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾ (رؤسا)و (أتباع)﴿يَتَسَاءلُونَ﴾ (سؤال)یان لێك ئەکرد؛ چۆن؟ ﴿قَالُوا﴾(أتباع)بە (رؤسا)یان ئەووت: ﴿إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا﴾لە (دنیا)یە ﴿عَنِ الْيَمِينِ﴾ لە (جهەت)ی (خێر)؛ ئێوە بێ (واسطة)نابێ، (عبادەت)ی خواداوەندی بکەن؛ ئەگەر (واسطة)نەبێ، خوا گەورەیە، (جواب)ی ئێوە نادا؛ (إلە) (تَمثّل)ئەکات، ئەوانە (تمثال)ی خوان.

(حلول)و (مظهر) (صفەت)هەم (نوع)ە (تمثل)ێکە خوا (غنی)یە، چەپەکی لەسەر (عبادەت)ی ئێوە کەوتوە؛ (گوناه)بکەن، چ (ضرر)ی لێ ئەکەوێ؟

﴿قَـالُوا﴾(رؤسـا)لـە (جـواب)یـان دا ﴿بَـل لَّـمْ تَكُونُـوا مُـؤْمِنِينَ﴾ خۆتـان (مُؤمن)نەبوون، ڕووتان لە (حقّ) (خـالی)لـە (خدعـة)و درۆو (تحویـە) (قبـول)ی ناکەن (أمّا)بۆ (خرافات)لە (غایەت)ی (إستعداد)و (حاضر)ی دان﴿وَمَا كَانَ لَنَـا عَلَيْكُم مِّـن سُلْطَانٍ﴾ (تسلّط)مـان لەسـەر ئێـوە نـەبوو، بـە (جـبر)و (قهـر)و (شـدّەت)ئێوەمـان وەرنـەگێرا ﴿بَـلْ كُنـتُمْ قَوْمًـا طَـاغِينَ﴾ (أساساً) (قـوم)ێ (مُتجاوز)بوون لە (حق)بە (میول)ێ (فاسد)﴿فَحَقَّ عَلَيْنَا قَـوْلُ رَبِّنَـا﴾ لـە (دنیـا) (علی لسان الرسل)ئـەیان فـەرموو:" ئێـوە گـەر لەسـەر ئـەو (کفـر)و (ضـلال)ە بمێنن، (عذاب)ی خوا ئەچێژن" ئەوا (تحقّق)ی ئـەکرد﴿إِنَّـا لَـذَائِقُونَ﴾ (ذُق إِنَّـكَ أَنْتَ العزيز الكريم)﴿ فَأَغْوَيْنَاكُمْ﴾ بە ئاسانی، وەکی (شـیطان)یـش ئـەڵێ:" مـن (دعـوەت)م کـردن، ئێـوە (إیجابـة)تـان کـرد" ﴿إِنَّـا كُنَّـا غَـاوِينَ﴾ ئەمـە ڕۆژێ (خصام)تـێ ئەگـەن، یـاخود وەکـی (طنطـاوی)و (أشـباه)ی، لـە (مُتـأخرین)ی شارەزا ئەفەرموون: (رؤسا)کان و وایان (حساب)ئـەکرد، (سـواد)ی (أعظـم) لـە (قوم)ی خۆیان (مقابل)ی (إیمان)بە (حقائق)ی (إلهیـات)بـین؛ بـت پـەرستی وە (بعض)ئاینینان بۆ دادەنان؛ (أمّا)خۆیان (معناً)لەسەر(إیمان)ی (صحیح)بوون" لام وایە (علی الأکثر)خۆیان وەکـی وان(میـل)ی بـت پـەرستی و بـەجێ هێنـانی ئاینیـان پەسـند و خـۆش هاتیـە؛ (رؤسـا)کـانیش گـومڕاە بـووین وەکـی (مـرؤس)ەکـان؛ (مـادام)وابـێ ﴿فَـإِنَّهُمْ يَوْمَئِـذٍ فِـي الْعَـذَابِ﴾لـە (أصـلی)دا ﴿مُشْتَرِكُونَ﴾ (عُذر)ی (مرؤس)ەکان (قبول)نیە؛ نێزێکە (جَزم)بێنم؛ (ضلال)ی (رؤسـا)لەمـەر (ضـلال)ی (أتبـاع)و (رعایـا)یـە؛ (نظـر)بەوانـەی (نوعامـا) (إستعداد)یان بوە، بۆ (إیمان)؛ بە (أنواع)ی (حِیَل) (حتّی) (تخویف)و (تحریم) لە (متاع)ی (دنیا)، (منع)یان ئەکەن؛ (عذاب)ی (معنوی)یەکەیان (أشدّ)ە ﴿إِنَّا كَذَلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ﴾ (تابع)و (متبوع)﴿إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّـهُ﴾ لە (إعـراب)ی (کلمـە)ی (طیبـة)وەکـی (سـیّدی آلووسـی)ئەفـەرموێ؛ "(أقـوال) هەیـە" حـەوت(قَـول)ی (نقـل)فـەرمووە؛ ئەگـەر کەسـێ (دەعـوەت)یـان بـۆ

